# شەپۆلی راگەیاندن

لەو مەبەستانەی کە پێویستە سەبارەت بەپێوەندی نێوان ئیسلام‌و ئێران باسی لێ بکرێ، مەبەستی کتێب سووتان‌لە ئێران بو بە دەستی موسوڵمانەکان کەزاڵ بوون بەسەر ئێران‌دا.

نزیکەی نیو سەتەیە کە بەرزدی لەسەر ئەو مەبەستە دەرۆن‌و وتار بڵاو ئەکەنەوە. ئەو درۆیە وەها، راستەقینە نیشان دراوە کە لە کتێبە سەرەتایی یەکان‌و، نێوەندی‌و، زانستگەییش ـ کەنابێ جگە لە مەبەستی راست‌و دروست شتێکی‌تر لە واندا باسی لێ بکرێ‌و، نابێ شتی رون‌نەکراوەوە ئاوێتەی زەین‌و بیری ساکاری منااڵان‌و دەرس خوێنەکان بکرێ ـ باسی لێ‌کراوە.

ئەگەر ئەو بەسەر هاتە ـ لە رواڵەتی مێژوویی‌دا ـ راست‌و باوەر پێ کراو بێت‌و موسوڵمانەکان کتێبخانە یا کتێبخانە کانیان لە ئێران و میسر ئاور تێ بەر دابێ، ئەکرێ بگوترێ کە ئیسلام شێوەو خدەی خاپور کردنی بوە، نەك دروست‌کردن و پێك‌هێنان. بە لانی کەمەوە، دەکرێ بگوترێ کە ئیسلام هەر چەند بەرهەم هێنەری شارستانێتی و فەرهەنگێك بوە، بەڵام رووخێنەری فەرهەنگ‌و شارستانێتی‌تر بوە.

کەوایە، لەبەرانبەر ئەو خزمەتانەی بەئیرانی کردوە، زەرەرو زیانیشی پێ گەیاندوە و ئەگەر لەلایەکەوە «بەخشندەی نیعمەت» بوە؛ لە لایەکی ترەوە، بوتە «بەڵا یەکی گەورە».

لەدەور و بەری ئەو مەبەستە کە بە راستی لە ئێران‌دا، کتیبخانە هەبوون‌و کانگەی زانست‌و فێرگەی وەك مەدرەسەی سەرەتایی و ناوەندی و زانستگە بوە و

هەمووی بە دەستی موسـولّمانانی سـەرکەوتوو لەناو چـوە، ئـەوەندە ویّژراوە و نووسـراوە کە بۆ هیّندیّ ئیرانی کە لەو بارەوە ناشـارەزان وردە، وەك بیر و بروایەکی راستەقینە، جیّگەی بۆخۆی کردوّتەوە.

## وتەی دوکتوریّك

چـەند سـالّ لەمەو بەر ژمارەیەك لە مەجللەی *تندرُست*ـ کە مەجللە یەکی تەنیا پزشکیە ـ کەوتە دەسـتم. لەو دا، کورتە یەك لەوتاری یەکیّك لەدوکتورەکانی بەناوبانگی ئیّران، لە زانستگا یەکی ولّاتەکانی رۆژئـاوا نووسـرا بوو. لەو وتارە دا، دوای ئەوە بەناوەرۆكو مانای شیعرەکانی سەعدی کە ئەلّیّ:

«بنی‌آدم اعضای یك پیکرند» ئیشارەی کردوە و وتوویە: بۆ یەکەم‌جار ئەم شاعیرە بیرو بروای کۆمەلّی نەتەوە یەك گرتۆکانی بە دلّدا هاتوە، بە وتاری خـۆی بەم چەشنە دریّژەی دابوو:

«یونان لە رابردوو دا، جیّگەی شارستانیّتی‌و ژیان‌باشی بوە. فەلاسفەو زانایانی گەورەی وەك سقراطو... بوە؛ بەلّام ئـەوەی بگـونجیّ بە زانسـتگەی ئـەمرۆی دابنیّین، بەراستی هەر ئـەو فیّرگە بووە کە خـوسرەو ـ پاتشـای سـاسانی ـ دای مەزراند و لەشـوش پیّتەختی ئیّرانی ئـەو وەختە، کانگـەو زانسـتگەیەکی گەورە، بەناوی «گوندی شاپور»... بوە ئـەم زانسـتگەیە بە دریّژایی چـەند سـالّ هەر ماو راوەسـتاو بوو، هەتا لەکاتی هیّرشـی عەرەبەکان بۆ ئیّران وەك دەزگا، دامەز راوەکانی دیکەی ئیّمە، لە ناو چوو، و هەرچەند ئایینی پیرۆزی ئیسـلام ئـاشکرا و پتەو رای‌گەیاندوە:

«زانست ئەگەر بیّتو لەولّاتی چین دەسکەویّ، ئەبیّ وەدەستی بخـەن»، عەرەبە زالّ بوەکان، ـ بەپیّچەوانەی دەستووری ئـاشکرای پیّغـەمبەری ئیسـلام ـ حـەتتا کتیّبخـانەی کۆمەلّایەتی ئیّرانیان ئـاگرداو تەواوی دەزگا، دامەزراوەکانی زانسـتی ئیّمەیان لەناو برد. لەوکاتەوە تا دریّژایی دو سـەتە، ئیّران لەژیّر دەسـەلّاتی عەرەبەکان دا، ماوە (١).

---

١) مەجللەی (تندرست) سالّی ٢٤، ژمارەی ٢.

**رەخنە**

لەم چەشنە و لەم ئـاکارە، کە بەبێ ناوبردنی هیچ بەڵگـەیەك، مەبەستی ئـاوا ئەوتریێو ئەنوو سریێ زۆرو زەوەندن.

ئێمە بەر لەمە، دەس کەین بە لێکۆڵینەوە یەکی مێژوییو، وتەی ئـەو کەسانەی کە هەر بەقسە، لیزگە دەلیلێکیان هۆنیوەتەوە، رەخنەی زانیاری بگرین، وڵامی ئەو دوکتورە بەرێزە، کە بەمچەشنە لە کۆڕێکی پزشکـی جیهـانی دواوە، کە بە رواڵەت زانیاری مێژویی ئەوانیش لەم دوکتورە زیاتر نەبوە، عەرز ئەکەم:

**یەکەم:** دوای دەورەی یونانو بەرلە دامەزرانی زانسـتگەی گوندی شـاپور، لەئێران، زانسـتگەی گەورەی تەسکـەندەرییە بوە، کە دەگەڵ زانسـتگای گوندی شاپور، شیاوی هەلسەنگاندن و بەرانبەری نەبوە.

موسوڵمانەکان کە لە سـەتەی دووەمی کۆچـی و بگـرە کەمێکیش لە سـەتەی هەوەڵی کۆچیدا، دەستیان کردوە، بە وەرگرتنو وەرگێرانی بەرهەمە زانستیەکانی بێگانە بەزمانی عەرەبی؛ تارادەیەکی زۆر لە شـوێنەوارو ئـاساری ئـەسکـەندەرانی کەڵکیان وەر گرت. درێژەی ئەمە لەکتیبەکانی سەبارەت بەم مەبەستە، ئەگونجـێ وە دەست بخەین.

**دووەم:** زانسـتگای گوندی شـاپور ـ کەزیاتر کانگـەیەکی پزشکـی بوە ـ چکـۆڵەترین سـەدەمەی لەلایەن عەرەبەکانی سـەرکەوتووەوە نەدیوە وتاسـەتەی سێهەمو چوارەمی کۆچی بە ژیانی خۆی درێژەی داوە. دوای ئـەوە، کە کانگـای گەورەی زانستی بەغدا، دامەزرا، زانسـتگەی گوندی شـاپور چـرای دەسـەڵاتی کوژاوەو کەم کەمە لەناو چـوو. خـەلیفـەکانی[1] عەبباسـی، بەر لەمە، بەغدا بێتە کانگای زانست، لەوجودی ئەستێرە ناسـان و پزشکـانی ئـەو گوندی شـاپورە، لە دەزگای خـۆیاندا، کەڵکیان وەرگرت، *ابن ماسویه* کانو بختیشـوع کان، لە سەتەی دووەم و سێهەمی کۆچی لەو زانستگەیە دەرس خوێندنیان تەواو بوە؛ کە وابوو، ئەم قسەیە کە زانستگای گوندی شاپور، بەدەستی عەرەبە زاڵ بوەکان لەناو براوە، ئەو پەری بێخەبەریە.

**سێهەم:** زانستگای گوندی شاپور زانایانی مەسیحی ـ کە سەبارەت بە ئایینو

---

١) راستترو جوانتر ئەویە «پاتشا»یان پێبڵێن تا «خەلیفە».

نەتەوە، سەر بە مەڵبەندو حەوزەی رووم (انطاكیە) بوون ـ هەڵیان دەسووراندو کاروباریان بەرێوە دەبرد، رۆحی ئەم زانستگایە، مەسیحی روومی بوو، نەك زەردوشتی ئێرانی. هەڵبەت ئەم زانستگایە لە روالەت، جوغرافیایی، ولەباری سیاسیو شارستانێتی سەر بەئێران و پێوەندی لەگەڵ ئێران‌بوو، بەڵام رۆحو هەناوێك کە ئەم زانستگایەی بەدی هێنابوو، هەناوێکی دیکە بوو، کە لەپێوەندی سەرۆکە کانی ئەم زانستگایە، بەدەزگای غەیری زەردوشتی سەرچاوەی ئەگرت. هەر وەکوو هێندێ لە کانگاکانی زانستی دیکە، لە (ماوراءالنهر) هەبوون کە لەژێر هۆ وهێزی بودائیە کان دامەزرا بوون.

دیارە رۆحی گەلی ئێران روحێکی زانستی بوە، بەڵام رژیمی موبەدی زەردوشتی داسەپاو بەسەر ئێران، لەدەورەی ساسانی دا، رژیمێکی دژی زانست بوەو تا هەر رادەیەك کە ئەم رۆحە زاڵ بوە، بەرگری لەپەرە گرتنی زانست کردوە. هەربەم دەلیلە باشووری رۆژئاواییو باکووری رۆژ هەلاتی ئێران، کە لەدەسەڵاتی رۆحی ئایینی موبەدان، دوور بوە، فێرگە و زانستی جۆرا وجۆری تێدا بوە و لەجێگاکانی دیکە کەئەم رۆحە زاڵ بوە، داری زانست هەڵی نەداوە.

**چوارەم:** ئەم دوکتورە، بەریزە، کە وەك هێندێ کەسی‌تر، بەچەشنی مەلی تووتی، لاسایی خەڵك ئەکەنەوە و ئەڵێن: «زاڵ بوەکانی عەرەب کتێبخانەی کۆمەڵایەتی ئێمەیان ئاگر داوە و تەواوی دەزگاکانی زانستی ئێمەیان لە ناوبردوە»؛ باشتر ئەوە بوو، روونیان بکردایەوە، کە ئەو کتێبخانە کۆمەڵایەتیە، لەکام جێگا بوە؟ لە هەمەدان بوە؟ لە ئیسفەهان بوە؟ لە شیراز بوە؟ لە ئازەربایجان بوە؟ لە نیشابور بوە؟ لە تیسفون بوە؟ لە ئاسمان بوە؟! لە ژێر زەوی بوە؟! لە کام جێ بوە؟. چلۆنە، کە ئەوان و کەسانی دیکەی وەك ئەوان، کە ئەم وتانە دووپاتە دەفەر موونەوە، لە کتێبخانە یەکی کۆمەڵایەتی ـ کە ئاگر دراوە ـ ئاگادارن، بەڵام، لە جێگەی بێ‌خەبەرن؟!.

نە تەنیا، لە هیچ بەڵگەیەك ئەو جۆرە مەبەستە ناو نەبراوە، بەڵکو هەرچەند بەسەر هاتی داگیرکردنی ئێرانو رووم بەوردیو روونی نووسراوە، نێوێك لە کتێبخانە یەکی ئێران، چ ئاگر درابێ و چ ئاگر نەدرابێ، لە هیچ بەڵگەیەکی مێژویی دا نیە.

## بڕوای دوکتور شەفەق

لەناو نووسەرانی کتیبەکانی ئـەدەبیو مێژویی و جوغرافیایی دەرسـی، بۆپۆلی ناوەندی (دەبیرستانی) کە زۆربەیان بەچەشـنی بەخشـنامە مەبەسـتی سـەرەوەیان دووپاتە دەکەنەوە، خوالێ خۆشبوو دوکتور رەزا زادەی شەفـەق ـ کە پیاوێکـی زانا بوو، و لەئینسافیش دوور نەبوو ـ تا رادەیەك چـاوەدێری ئینسـافی کردوە، ناوبراو، لە مێژوی ئەدەبیاتی پۆلی چوارەمی ئەدەبی دا، لەو بارە وە بەم چەشنە ئەنووسێ:

«لە دەورەی ساسانی شوێنەواری ئایینیو ئەدەبیو زانستیو مێژویی لە نووسراو و وەرگێراوەوە، زۆر بوە، هەر وەها لەو ئاگاداریانە کەسـەبارەت بە شـاعیرانو لاوك وێژانی دەرباری، بەئێمە گەیشـتوە، وا دەر ئـەکەوێ کە وتەی ڕێك (شـیعر) بوەو سەرە رای ئـەمەش، لەشـێوەی وتەی مێژو، دەکرێ تێ بگـەین کە شـوێنەواری ئەدەبی لە دەورانی پێشوو، زۆر بەر بڵاو بوە. بەڵکە تارادەیەك، تایبەتی دەرباریەکان و ئایینیەکان بوەو لەبەر ئەمە لەئاخرو ئوخری دەورەی ساسانی، ئاکارو ژیانی ئـەو دوو چینە، یانێ دەر باریەکانو ئـایینیەکان، بەهۆی زۆر بوونی چـەوتیو چـەپەڵی دەرباریەکانو، بەدی هاتنو پەیدا بوونی لكوپۆی جـۆر بە جـۆر لە ئـایین‌دا، پیس بیوو. جا بەو هۆیەوە، ئـەتوانین بڵێین: چلۆنایەتی ئـەدەبی ئێرانیش، لەکاتی بەدی هاتنی ئیسلام، گرشەدار نەبوەو بەهۆی چەپەڵی ئـەو دووچینە، ئـەدەبیاتیش بەرەو نەمان دەرۆیشت.

## زانست و فەرهەنگ لەناوچەی زەردوشتی

لە بەڵگەو نیشان، دەر ئەکەوێ کە لەمەڵبەندی زەردوشتی، زۆر حەز لە زانستو فەرهەنگو نووسەری نەکراوە.

**جاحِظ** هەرچەند عەرەبە، بەڵام لایەنگـری عەرەب نەبوە. چـونکە دژی عەرەب زۆری نووسیوە. ئێمە ئێسـتا وتارێ ئـەوتان بۆ دەگێرینەوە. لە کتێبی «المحـاسن والاضداد»[1] دا، ئەڵێ:

«ئێرانیان زۆر حەزیان لە کتێب نووسین نەدەکرد، زیاتر دڵیان بە خانوو دروست کردنەوە بوو»

---

١) لاپەرەی ٤٠.

له کتێبی «شارستانێتی ئێرانی»، نوو سراوەی پوڵێك له ڕۆژ هەڵات ناسان[٢] ڕوونی ئەکاتەوە: نووسین، له، ئایینی، زەردوشت و له زەمانی ساسانیدا، ڕمێنو برەوی نەبوە.

ڕوون کەرەوە کان، بروای تێکرایییان هەیە کە حەتتا نووسینەوە و زیادکردنی نووسخەکانی ئەوێستا، بەرگری لێ کراوە و بەربڵاو نەبوە، وا دێتە بەر چاو کەکاتێ ئەسکەندەر پەلاماری بۆ ئێران هێنا، له ئەوێستا تاقە دوو دانە زیاتر نەبوە، کە یەکیان لە شاری (ئیستەخر) بوە کە ئەسکەندەر ئاگری داوە.

بەم هۆیەوە، دەرس و فێرگەو خوێنەریو زانیاری، له ئاایینی موبەدی دا، بەتایبەت هەر بۆ دەرباریەکان و پیاوە ئاایینیەکان بوەو بۆ چینەکان وتاقمە کانیتر، بەرگری لێ کراوە. ئەوە بوو کە زانستو کتێب، پەرەی نەدەگرت چونکە بە تایبەت زانایان، لەچینی بەشخوراو هەڵدەکەون نە لەچینی تەسەل.

بەچکە پینەچی و چەکمەچیو گۆزە کەرەکانن کە ئەبنە بوعەلیو ئەبوریحانو فارابیو موحەممەد زەکەریای ڕازی، نەك منالی خانو بەگو بەچکەی گەورە ماڵان. جگە لەمەش، هەر بەو جۆرە کە خوالێ خوشبوو دوکتور شەفەق ئەڵێ، ئەو دوو چینەش لەزەمانی ساسانی هەرکام بە چەشنێ، چەپەڵ ببوون و چینی چەپەڵ، چاوەڕوانی شوێنەواری زانستیو فەرهەنگی لێ ناکرێ.

---

٢) لاپەرەی ١٧٨.

# کەمتەر خــەمی ئیرانیان لە راگرتنی شــوێنەواری بەر لە ئیسلام

بێ گومان لە ئیرانی ساسانی‌دا، شوێنەواری زانستی‌و ئـەدەبی زۆر تا کەمێك، هەر بوە. زۆر بەی ئــەوانە، لە دەورەی ئیســلامی‌دا، بەعەرەبی وەرگێر دراون و ماونەتەوەو بێ‌گومان، زۆر لەو ئـاسار و شـوێنەوارە، زانسـتی‌و ئـەدەبی‌یانە، لەناو چوون؛ بەڵام نەك بەهۆی کتێب سووتاندن، یان بەسەر هاتێکی لەم چەشنە، بگـرە بەم‌هۆی سروشتیە، کە هەر کاتێك ئاڵ‌و گۆڕێك بەسەر بیرو بروای خەڵك دا دێت‌و فەرهەنگێك هێرش دەباتە سەر فەرهەنگێکـی دیکـە؛ بیرو باوەران، بۆ لای خـۆی رادەکێشێ فەرهەنگی کەونارا، بەچەشنێکی زۆر و زیانبار ئەخـرێتە بەر بێ بەزەیی‌و سەرنج نەدران‌و شوێنە وارەکانی زانستی و ئەدەبی سـەر بەو فـەرهەنگـە، بەهۆی نەبوونی چاوە دێری‌و دڵ پێوەنە بوونی خەڵك، کەم‌کەمە لەناو ئەچێ.

نموونەی ئەمە، ئەمرۆ، لە هێرشی فەرهەنگی رۆژ ئـاوا، بۆ سـەر فـەرهەنگـی ئیسلام ئەبینین.

فەرهەنگی رۆژئاوا، لەناو خەڵك دا بۆتە (باو)و فـەرهەنگـی ئیسـلامی لە (باو) کەوتوە. هەر بەم دەلیلە لەراگرتن و ئاموژگاری ئەوانەدا، تێ کۆشان نیە.

نوسخە بایەخدارەکان، لە زانستەکانی: طبیعی، ریاضی، ئەدەبی، فەلسـەفـی و دینی، لە کتێبخانە کانی تایبەتی‌دا، تا چەند سـاڵ لەمەو بەر بوە و ئێسـتا روون نیە چی لێ هاتوە و لەکوێ‌یە؟

وای لێ‌هاتوە، لە دوکانی بەققـاڵی دا کەڵکـی لێ وەر دەگیرێ، یان وەبەر با دراوە. بەپێی باسگێرانە وەی ئـوستاد (*جـلال‌الدین همائـی*)، ژمارەیەکی زۆر لەکتێبەکانی شاز و هەڵکەو تووی دەس‌نووس، کە (*باقـر مەجلسـی*) لە سـوێنگەی

دەسەڵاتێکـــی کە لە زەمانی خـــۆی دا بووی، لە گۆشـــەو کەناری جیهـــانی ئیســـلامی‌یەوە کۆی کرد بوونەوە ناوکتێبخـــانەی خـــۆی، بە گۆترە، یان ســـەنگ‌و تەرازووو، بە خەڵك فرۆشران.

بەپێی نەرێت‌و یاسا، دەبێ لەکاتی گیرانی ئێران، کتێبان کە هێندێ لەوانە شـاز و هەڵکە وتوو بوون، لە کتێبخانە کانی تایبەتی خەڵك‌دا بووبێت. ئەگونجـێ تا دوو سێ سەتەش دوای گیرانی ئێران، راگیرابن؛ بەڵام دوای گیرانی ئێران و ئیسـلام هێنانی خەڵك‌و، وەبرەو کەوتنی خـەت‌و زمانی عەرەبی‌و لەبیر چـوونەوەی خـەت‌و زمانی پەهلەوی ـ کە ئەو کتێبانە، بەو خەت‌و زمانە بوون ـ ئـەو کتێبانەش، بۆ زۆر بەی خەڵك بێ کەڵك بوون‌و کەم‌کەمە لەناو چوون.

بەڵام ئەوەی کە کتێبخانە یا کتێبخـانان بوون‌و، دەزگا دامەزراوە کانی زانسـتی هەبوون‌و عەرەبەکانی زاڵ‌بوو، لەکاتی گیرانی ئێران، ئەوانەیان بەئانقەسـت لەناو بردبێت، چیروکێکی خەیاڵی زیاتر نیە.

# بەڵگە کانی تیتاڵکە رانی کتێب سوتان

ئیبراهیم پورداود ـ کە تا رادەیەك نیهـادو دەرونی ئـەو ئـاشکرایە و بەوتەی خواڵی خوشبوو (قەزوێنی) لەگەڵ عەرەبـو هەرچـی لەلایەن عەرەبە، دوژمنە ـ تیٚ کۆشاوە لە سووچو قوژبنی مێژو، ئەوەی شکی بۆی چوە (بەڵگـە) بدوزیتەوە. ئـەو شك بۆ چوانە، کە حەتتا ناکریٚ ناوی (قـەرینە) شـیان لیٚ بنریٚ (ئـەگونجـیٚ بە تێكدانو گۆران) لەگێرانەوە دا، بەنێوی بەڵگە بۆ کتێب سـوتانی عەرەبەکانی زاڵ بوو لە ئێرانو وەبەر با درانی دەزگا دامەزراوە کانی زانسـتی ئێران، کەڵکـی لیٚ وەرگریٚ.

دوای ئەو و لەسۆنگەی ئـەو دا، تاقمێك کە لانی کەم چـاوەروانی ئـەوەیان لیٚ ناکریٚ کە بچنەژێر باری مەبەستی روون نەکراوەوە و باوەر پیٚنەکراو، شوێنی ئەو کەوتونو لاسایی ئەویان کردوٚتەوە.

خـوا لیٚ خـوشبوو دوکتور موعین لەو کەسـانەیە. دوکتور موعین لەکتیبی «مەزدیستاو ئەدەبی فـارسی» لەو جێگـایە دا کە ئـاکامەکانی هێرشـی عەرەب بوٚ ئیران باس دەکا، هەڵی کوتاوەتە سەر ئەم مەبەسـتەو زیاتری ئـەوانەی ئـەیڵیٚ لە قسەکانیَ پورداودە. ئەوەی بەناوی بەڵگە وتوویە، بریتین لە:

١ـ سرجان ملکم ئینگلیسی لە مێژوە کەیدا، ئەم رووداوەی ناوبردوە.

٢ـ لە زەمانی جـاهلییتو نەزانی عەرەبـدا ئـەو کاتە کە ئیسـلام بەدی هات، خەڵك بیٚزانستو نەخوێندەوار بوون، بەگوێرەی باسگێرانەوەی (واقدی) لە شاری مەککەدا، هاو زەمان لەگەڵ بەپێغەمبەری گەیشتنی حەزرەتی رەسـولٚ، ١٧ کەس لەقـورەیش خـوێندەوار بوون، دواییین‌ترین شـاعیری بیابانی عەرەب (ذوالرٚمە)

خوێندەوار بوونی خۆی دەشاردەوەو ئەیگوت: توانایی نووسین لە ناو ئێمەدا، بە بێ ئەدەبی دەناسری[١].

٣ـ *جاحِظ* لە کتیبی *اَلبَیان وَ التَبیین* دا، ئەگێڕێتەوە کە: ڕۆژێك یەکێك لە سەرۆکەکانی بنەماڵەی قورەیش، منالێکی چاو پێ کەوت کە خەریکی خوێندنەوەی کتیبی سیبویه بوو، نەڕاندی کە: «شەرم کە، ئەمە کاری مامۆستایان و سوالکەرانە».

لەو، ڕۆژگارە دا، مامۆستایی یانی دەرس پێ کوتن‌و بارهێنانی منالان، لەناو عەرەبدا زۆر سووکـو بێ بایەخ بوو چونکە مووچەی ئەوان، لەشەست درهەم زیاتر نەبوو. ئەم بەراتە زۆر بێ‌بایەخ بوو[٢].

٤ـ *ابن خلدون* لە بەشی «العلوم العقلیه واصنافها» (لە سەرەتای مێژووەکەی) ئەڵێ: کاتێ وڵاتی ئێران گیرا، لەو سەر زەوینە زۆر کتێب وە دەست عەرەب کەوت؛ *سعدبن ابی‌وقّاص* سەبارەت بەو کتێبانە بۆ *عمربن الخطّاب* نامەی نووسی و لەبارەی وەرگێڕانەوەی ئەو کتیبانە، بۆ موسوڵمانان ئیجازەی ویست. عومەر بۆی نووسی کە ئەو کتیبانە لە ئاو خات، چونکە ئەگەر ئەوەی لەو کتیبانە دایە، ڕێنموونیە خودا بۆ ئێمە ڕێگانیشاندەرێکی دیکەی وەرێ خستوە، و ئەگەر ڕێون کەرە، خودا ئێمەی لە خراپەی ئەو دوور خستۆتەوە. لەبەر ئەمە ئەو کتیبانەیان لە ئاو یا لە ئاگرخست‌و زانستەکانی ئێرانی، کە لەو کتیبانەدا کۆ کرابوونەوە، لەناو چوون، و وەدەست ئێمە نەکەوتن (١)

ابوالفَرَج لە مختصر الدوَل، و عبداللّطیف بغدادی لە کتیبی الافاده وَ الاعتبار، وقفطی لە تاریخ الحماءِ، لە شەرحی حاڵی یحیی نحوی و حاج خلیفە لە کشف الظنون، و دوکتور صَفا لە تاریخ علوم عقلی دا، سەبارەت بە سووتانی کتیبە کانی ئەسکەندەرییە بەدەستی عەرەب، وتاریان بڵاو کردۆتەوە (یانێ ئەگەر روون ببێتەوە کە عەرەبە سەر کەو تووەکان، کتیبخانەی ئەسکەندەرییەیان ئاور، تێ بەر دابێ، شوێن دەچێتەوە سەر ئەوەش لەهەر جێگەیەك کتێبخانەیەکیان دۆزیبێتەوە

---

١) وەرگێراو لە (تجلیّات ایرانی) لاپەرەی ٣٧ و ٣٦.

٢) وەرگێراو، لە: مێژوی ئەدەبیاتی دوکتور سورەتگەر، لەبڵاو کراوە کانی «مۆسسەی وعظ و خطابە». لاپەرەی ١٠.

١) بە گێڕانەوەی پورداود، لە یشتها، ج ٢، لاپەرەی ٢٠.

سووتاند بێتیان. کەوا بوو دوور نیە لە ئێرانیش‌دا ئـەم چـەشـنە کارەیان کردبێت.)
بەڵام شبلی نوعمان لە کتێبیلکـەیەك دا، بە ناوی «کتێبخـانەی ئـەسکـەندەرییە»
وەرگێراوی فـەخـری *داعی*، و هەروەها ئـاغای (مجتبی مینوی) لە مەجللەی
سُخن‌ی ٧٤، لاپەرەی ٥٨٤، ئەم وتەیە (کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە)ی بەدرۆ
زانیوەو بڕوای پی‌نە کردوە.

٥ـ ئەبو ریحانی بیرونی لە «آلاثار الباقیة» لەبارەی خوارەزمەوە ئەنووسـێ کە:
«چون قتیبةبن مسـلم خـوارەزمی دوای لەئـایین وەر گەرانی خـەڵك داگیر کرد،
*اسکجموك* کرا بە حاکمی ئەوان ئاگادار بوو، و لەزانسـتی ئـەوانی دەزانی، تێکـرا
لەناوبردو ئەوانی لە گۆشەو کەناری زەوی بڵاو کردەوە. لەبەر ئـەمە، هەواڵە کان و
چلۆنێتی حـاڵی ئـەوانە، تاوەها رادەیەك نهێنیو شـاردراوە ماوەتەوە، کە هیچ
وەسیلەیەك بۆ ناسینی راستە قینەکانی حاڵو ئەحواڵی ئەو وڵاتە دوای بەدی هاتنی
ئیسلام بە دەستەوە نیە»[1]. دیسان ابورەیحـان هەرلەو کتیبەدا ئـەنووسـێ: «لەبەر
ئەوە قتیبةبن مسلم نووسەرانی ئەوان (خوارەزمیان)ی کوشتو هەر*بزانی* ئـەوانی
کوشتو کتیبەکان و نووسراوە کانی ئەوانی سـووتاند، خـەڵکـی خـوارەزم
«نەخوێندەوار» مانەوە، ئـەو شـتانەی کە پێویسـتی ئـەوان بوو، تەنیا بەوانەی لە
دڵ‌دا رادەگیرا، پاڵیان داوەو چـون ماوە درێژەی خـایاند و رۆژگارێکـی درێژ،
بەسەریاندا تی‌پەری، مەبەستە پچوکەکانی هۆی جیاوازیان لە بیر چۆوە و تەنیا ئەو
مەبەستانەی بروای گشتی بوون، کە لەبیر ئەوان مایەوە[2]».

٦ـ چیرۆکی کتیب سـووتانی عەبدوللای کوری تاهیر، کە دەوڵەتشـای
سەمەرقەندی لە *تذکرةالشعرا* دا پێکیەوە ناوە.

***

ئەوانە تەواوی گوایە بەڵگە کانی خوا لی‌ خۆشبوو دوکتور موعین پێك دێنن، کە
بۆ کتیب سووتان لەئێران‌دا هێناویە تەوە. لەناو ئەم دەلیلانە، بەڵگەی چوارەم کە
لە *ابن‌خلدون* گێر دراوەتەوە، جگـە لەمە لەگەڵ چیرۆکی کتیبسـووتانی
ئەسکەندەرییە، کە *ابن العبری* و *بغـدادی* و *قفـطی* ئـەوەیان گێراوەتەوە و دەگەڵ

١) گێرانەوە لە پورداود لە (یشتها) ج ٢، لاپەرەی ٢٣ و ٢١.
٢) گێرانەوە لە «الاثار الباقیە» چاپی لیدن، لاپەرەی ٣٠.

ئەوەی حاجی *خلیفه* لە *کشف الظنون* دا باسی دەکا و بە شیاوی بروای دادەنێ، گرینگیەکی تایبەتی هەیەو ئێمە تەواوی ئەم دەلیلانە شی دەکەینەوە.

بەڵگەی حەوتەمیش هەیەکە خوا لێ خۆشبوو دوکتور موعین بەلایەوە نەچوە، بەڵام جورجی زەیدان‌و هێندێك لە نووسەرانی ئێرانی، زۆر بیرەوەری لێ دەکەن و بە بەڵگەی دوژمنایەتی عەرەب لەگەڵ کتیب‌و نووسین‌و زانست دەگرن و ئەویش ئەمەیە کە: خەلیفەی دووەم سەخت پێشی لە نووسین‌و نووسینەوەی کتیب دەگرت‌و بە هێنانەپێشی دروشمی: «حَسْبُنا كِتابَ الله» (ئێمە قورئانمان بەسە) سەخت‌و پتەو کتیب نووسین‌و بەرهەم هێنانی کتیبی بەرگری کردبوو، و هەرکەس دەستی بدابایە کارێکی ئاوا، بە تاوانبار دەناسرا. ئەم بەرگریە، تاسەتەی دووم درێژەی خایاند و لە سەتەی دووەم را، زۆرە ملەی زەمان تێکی شکاند.

ئاشکرایە خەڵکێکی لانی کەم تا سەت ساڵ بە خۆیان بریارو ئیجازەی کتیب دانان‌و نووسین نەدەن، حاستەمە کە ئیجازەی کتیب نووسین‌و نووسەری لەو ماوەیەدا بە گەلەکانی تێ شکاو، درابێت.

ئێمە لە هەوەڵە وە، ئەو دەلیلانەی کە خوالێ خۆشبوو دوکتور موعین هێناویەتەوە، جگە لە بەڵگەی چوارەمی ئەوان، رەخنەگری و شی‌کردنەوەی لەسەر دەکەین‌و دوایە بە حەوتەمین دەلیل رادەگەین، ئەوکاتە بە درێژە باس لە بەڵگەی چوارەم دەکەین.

# وتەی سرجان ملكم

ئەمما، بەڵگەی یەكەم یانی وتەكانی سرجان ملكم مان ئێمە لەكتێبی «*خزمەتە كانی دەستە واوی ئیسلامو ئێران*» بەشی دووم لەژێر سەر دێری «*دەر برینی برواكان*» رەخنەمان گرتوە و بێبایەخ بوونی ئەوانەمان روون كردوەتەوە.

سرجان ملكم بە گوێرەی گێرانەوە لە كتێبی «*مەزدیستاو ئەدەبی فارسی*» ئەڵێ:

«پێغەمبەری عەرەبی، لە بەر بەرەكانی و سەرسەختیەكی كە ئێرانیان سەبارەت بە بەرایی لەوڵاتو ئاایینی خۆیان كردیان، بە چە شنێك توورە بوو، كە كاتێ بەسەریاندا زاڵ بوون، هەر شتێكی بە هۆی پتەو بوونی گەلویستی ئەوانیان زانی، دایانە بەر خاپووریو لەناو چوون. شارە كانیان وێران و ئاگرگە كانیان سووتاندو موئبەدەكان كە كاروبار و ئاموژگاری لە خزمەتەكانی گشتی و جێگای ستایش و نیایشیان بە دەست بوو، وەبەر شەمشیردا و كتێبەكانی پیاوە گەورە كانی گەل، بە تیگرایی ئەوانەی كە سەبارەت بە زانست نووسرا بوون، یا لەبارەی مێژو، و مەبەستەكانی ئاایینی بوون و ئەو كەسانەی كە ئەو چەشنە كتیبانەیان لە دەست دا بوو، لەناو برد. عەرەبی سەختگیر لەو زەمانەدا، جگە لە قورئان نەكتێبێكی دیكەی دەناسی و نەدەویست بیناسێ؛ موئبەدەكانیان بە ئاگر پەرستو سیحرباز ئەزانیو كتیبەكانی ئەوانیان بە سیحرو جادوو، دادەنا. لە چلۆنایەتی كتێبەكانی یونانو رووم دەكرێ لێكی دەینەوە، كە كتیبەكانی وڵاتێكی وەك ئێران چەندە لەو «لافاوە بەجێ دەمێنێتەوە»[1].

---

١) بە گوێرەی گێرانەوە لە كتیبی مەزدیستاو ئەدەبی فارسی، لاپەرەی ١٣.

لە کتێبی خزمەتەکانی دەستەواوی ئیسلامو ئێران وتومانە: ئەوەی ئـەم ـ دای بنێین ـ مێژو ناسە، ئەیلێ شتێکی تازەیە، چونکە لە هیچ بەڵگـەو نیشـاندەرێکـی مێژوویی دا، نابیندرێ. ناچار ئـەبێ دای بنێین کە ئـەم مێژو نووسـە، بەڵگـەو مەدرەکێکی وەدەسـت کەوتبێت کە چـاوی هیچ حـەڵاڵزادەیەك ئـەوەی نەدیوە و، وەدەستی کەس نەکەوتوە، وبەچاکیشی نەزانیوە کە ئەو بەڵگـەو مەدرەکە ئـاشکرا بکرێ. بەڕاستی ناچـارین وای دابنێین چـونکە ئـەگەر وای دانەنێین، خـوای نەخواستە، لەبروا پاکی و ئەو پەڕی راسـتیو راسـتوێژی ئـەم مێژو نووسـە پایە بەرزە ـ کە هەڵبەت هیچ راسپێر دراویەکی لەلایەن وزارەتی کاروباری دەرەوەی ئنگلستان بۆ نووسینی ئەم کتێبە نەبوە ـ هێندێك درۆ دۆنگ بینو ئەم کارەش چلۆن دەکرێ؟!

ئەوەی ئەم مێژو نووسـە لەبەڵگـەو مەدرەکی نەبیندراو دا، کە جگـە لە «ئـار شیوی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئنگلستان» لە جێگایەکیتر نابیندرێ دەسـتی کەوتوە، ئەمەیە کە:

**یەکەم** ـ بەپێچـەوانەی وتەی تەواوی مێژوناسـان، ئێرانیان بۆ پارێزگاری و بەرایی لە نیشتمان و ئاینی خۆیان، خۆیان دەگرت و پێیان دادەگرتو سـەرەرای ئەو هەموو خۆگرتن و پێگرتنە و بەو هەموو خەڵکە زۆرە وە، کە زیاتر لە سـەت و چل میلیون لەو زەمانەدا، داندراوە، بەم هەمو چەكو کەرەسەوە، لەکۆمەڵێکی چـل پەنجـا هەزار کەسـی عەرەبی پاپەتی، کە سـەبارەت بە ژمارە، کەمتر لە دەیەکی چەکدارە کانی ئێران بوون و لەبابەت چـەكو کەرەسـەی شـەروە، شـیاوی هەڵسەنگاندن نەبوونو فێڵو فەنگی شـەری ئـەو زەمانە شـیان زۆر نەدەزانی، تێ شکان. کەوایە بە بروای پتەو، ئەو تێشکانە بەگوێرەی وتەی ئەم نووسەرە، ئەبێ بەحیسـابی خـوێریگەری گەڵی ئێران دابندرێ نەك هۆی نارازی بوونی ئـەوان لە حکومەتو ئایینو نارێكو پێکی ناو خـۆ و نەك بە حیسـابی سـەرنج راکێشـەری ئایینو ئیدئولوژی تازە، بە ناوی ئیسلام.

**دووەم** ـ شـارەکانی ئێران بە دەسـتی عەرەبە موسـوڵمانەکان، دەگەڵ خـاك تەخت کران. ئەم شارانە، لە کام جێگا بوون و ناویان چی بوە و لەکام کتێبی مێژو دا، ناوی ئەوانە براوە؟! وەڵامەکەی سرجان ملکم، ئەبێ خۆی بیداتەوە.

**سێهەم** ـ موبەدەکانو کار بە دەستانی جێگاکانی ستایش وەبەر تیغو شەمشیر

دران‌و ئاگرگه‌كان به ئـاگر سـووتێندران؛ به‌ڵام ئـه‌وه‌ی كه مێژو نووسـانی وه‌ك مه‌سعودی و موقه‌دده‌سی‌و هی دیكـه‌ی وه‌ك ئـه‌وان نووسـیویانه، كه تا زه‌مانی ئه‌وان (سنووری سه‌ته‌ی چـواره‌م) هێشـتا ئـاگرگه كان ماون‌و له جێی خـۆیان ماونه‌ته‌وه و حه‌تتا مه‌زنه‌كانی موسوڵمانان له په‌یمانی ئـاشتی‌دا، شـه‌رت ئـه‌كه‌ن‌و بریار ئه‌ده‌ن، كه جێگاكانی ستایشی ئـه‌هلی كتێب، له‌و چـه‌شـنه مه‌جـوس، ئامۆژگاری لێ بكه‌ن؛ مه‌به‌ستێكه كه ئاغای سرجان ملكم نایه وێ له‌باره‌ی بدوێ.

**چواره‌م** ـ كتێبه‌كانی زانستی‌و ئایینی ئێران و كه‌سانێكی ئه‌م كتێبانه‌یان لابوه، تێكڕا له ناو چوون.

**پێنجـه‌م** ـ عه‌ره‌به موسـوڵمانه‌كان موبه‌ده‌كانیان به سـیحرباز و كتێبه‌كانی مه‌جوسیان (زه‌ردوشتی) به سیحرنا و ده‌برد. ئه‌مه‌ش مه‌به‌ستێكه كه بۆ یه‌كه‌م جار له‌زمانی ئه‌م مێژو نووسه بێ‌غه‌ره‌زه، ده‌كرێ ببیستری[1].

سرجان ملكه‌م له‌سه‌ته‌ی ١٣ ی كۆچی‌دا ژیاوه، و له‌به‌سه‌ر هاته‌كانی سه‌ره‌تای ئیسلام، نزیكه‌ی ١٣ سه‌ته دووره؛ ئه‌گه‌ر ئه‌و به‌مرۆڤێكی بێ‌كینه‌و سـاغ دابنێین، له‌وباره وه كه بۆخـۆی نه‌ی دیون، وته‌كانی ئـه‌و كاته جێی بروایه، كه به‌ڵگـه‌و نیشانده‌رێك بنوێنێ، وئـه‌و هیچ به‌ڵگـه یه‌ك نیشـان ناداتو ناتوانێ نیشـان بدات چونكه وجودی نیه.

## نه‌خوێنده‌واری عه‌ره‌ب

ئـه‌مما ده‌لیلی دووه‌م ـ یانی مه‌به‌سـتی (نه‌خـوێنده‌واری)و بێ‌سـه‌وادی عه‌ره‌بی پێش ئیسلام (ده‌وره‌ی جاهلی)، مه‌به‌ستێكه كه قورئان بۆخۆی بروای به‌وه هه‌یه، به‌ڵام ئه‌مه چ به‌ڵگه‌یه‌كه؟! ئـایا ئـه‌مه، كه عه‌ره‌بی جـاهلی (پێش ئیسـلام) نه‌خوێنده‌وار بوون ده‌بێته ده‌لیل بۆئه‌وه‌ی عه‌ره‌بی ئیسلامی كتێبیان سووتاندوون؟. له‌به‌ینی ده‌وره‌ی جاهلی هه‌تا ده‌وره‌ی پێشره‌وی ئیسـلام ـ كه بیسـتو پێنج سـاڵ زۆرتری نه‌خایاند ـ قیامی قه‌ڵه‌م، له‌لایه‌ن پێغـه‌مبه‌ری مه‌زنه‌وه له‌مه‌دینه پێك هات كه سه‌ر سوورێنه‌ره.

ئه‌م عه‌ره‌به نه‌زانه، رووی كرده ئایینێك كه راسپێرده‌ی ئه‌و ئـایینه، «فـدیه»ی

---

١) خزمه‌ته‌كانی ده‌ستهواوی ئیسلامو ئێران ـ چاپی شه‌شه‌م لاپه‌ره‌كانی ١٦١ و ١٦٢.

هێندێك لەو یەخسیرانەی ـ كە خوێندنەوە و نووسینیان ئەزانی ـ سەوادداركردنی منالە موسولمانانەكان دانا. پێغەمبەری ئەو ئایینە، كۆمەڵێك لە ئەسحابو یارانی خۆی بۆ فێر بوونی زمانەكانی غەیری عەرەب، وەكوو سریانی و عبری و فارسی هان دا. بۆ خۆی تاقمێك نزیكەی بیست كەسی «نووسەر» هەبوو؛ هەركام دەگەڵ چەند كەس كرانە لێپر سراوەی دفتەرێك و كارێك[1]. ئەم عەرەبەی «جاهلی» ڕووی كردە ئایینێك كە كتێبە ئاسمانیە كەی بەقەلەمو نووسین سوێند ئەخوا[2] و (وحی) ئاسمانیەكەی دەگەڵ «خوێندنەوە»و «فێر بوون» دەس پێ دەكا[1]. ئایا كردەوەی پێغەمبەر و ڕێزگرتنی قورئان لە خوێندنەوە و نووسینو زانین، لە عەرەبی جاهلیدا، كە دڵیان بەلای قورئان و پیغەمبەرەوە بوو، نەبوّتە هوّی بەدیهاتنی هەستی خوّشبینی، سەبارەت بەكتێبو نووسینەوە وزانستو فەرهەنگ؟!.

## شكاندنەوە ولەبەر چاو سووك بوونی ماموّستایی، لە لایەن قوریشەوە

بەڵام بەڵگەی سێهەم، یانی بێ بایەخ بوونی ماموّستایی لەپێش چاوی قورەیشو عەرەبەكانی دیكە.

ئەڵێن قورەیشو عەرەب، بارهێنان و فێركردنی منالەكانیان بەخوێندن و نووسین، بە سووكایەتی داناوە و كاری ماموّستاییان، بە كارێكی بەرز نەزانیوە و بگرە لەریشەوە خوێندە واریان بە شوورەیی ئەزانی.

لەو وتەیەدا، ئاشكرایە كە پیشەی ماموّستاییو دەرس كوتن، لەبەر كەم بوونی مووچە، بێبایە خیان زانیوە. یانی هەر ئەم شتەی، كە ئەمرۆ لەئێرانی خوّماندا دەی بینین. ئاموّژگارانو دەبیرانو مەلاكان لە چینەكانی كەم داهاتی كوّمەڵنو وێ دەچێ تاقمێك هەر بەم هوّیەوە، پیشەو ئەركی سەر شانیان دەگوّرن.

هەموو دەزانین كە ئەگەر لاوێكی ئاموّژگار، یا دەبیر یان مەلا، بچێتە خوازبێنی

---

١) روانین لە كتیبیلكەی «پیامبر، اُمّی» نووسراوی **مرتضی مطهری**.

٢) ن وَالقَلَم وَما یسطرون، سورەی (قَلَم).

١) اِقرَأ بِاسمِ رَبِكَ الَّذی خَلَق، خَلَقَ الاِنسانَ مِنْ عَلَقْ، اِقرا وَرَبُكَ الاَكرَم، اَلَّذی عَلَّمَ بِالقَلَم، عَلَّمَ الاِنسانَ مالَم یَعلَم. سورەی (عَلَق)

کچێك‌و ئەو کچە خوازبێنی کەرێکی لەچینی کاسب وەیا، پەیمانکار و... هەبێ ئەگەر چی نەخوێندواریش بن، زیاتر (بەشاز هەڵدە کەوێ بە پێچەوانەی ئەوە بێت) کەس‌و کاری کچەکە، ئەوە بەباشتر دەزانن کە کچەکەیان بدەن بەو کاسبە یا پەیمانکارە، نەك بەو ئامۆژگار یا دەبیرە یان مەلایە. بۆچی؟

ئایا بەهۆی ئەمەیە، کەزانست‌و مەعنەوییەت واتە زانین‌و بیرو بروای بەرزو جیالەماڵی دنیا، سووك‌و بێبایەخ ئەزانن؟ هەڵبەت نا، پێوەند یەکی بە شکاندنەوەی زانست نیە، کچ بەشوو دان بەو چەشنە چینە هێندێك لەخۆ بوردنی پیویستە و هەموو کەس بۆ لەخۆ بوردویی ئاوا، ئامادەنین،

سەیرە، بەم دەلیلە کە یەکێك لە قورەیش کتێب خوێندنە وەی منالێکی شکاندۆتەوە، کەوا بوو عەرەب بە بەتەواوی دووژمنی زانست‌و نووسینەوە بوون، بەم هۆیە پێی ناوەتە هەر جێگەیەك کتێبەکانی ئاگر داوە. ئەوە دروست وەك ئەمەیە، کە بڵێن بەم دەلیلە کە عوبەیدی زاکانی نووسەری زاناو شاعیری ئێرانی کوتویە:

**ای خواجه مکن تا بتوانی طلب علم**

**کاندر طلب را تب یك روزه بمانی**

واتە: ئەی ئاغا! تا دەتوانی، هەست‌و ویستی زانستت نەبێ کە لەو هەست‌و ویستەدا، بۆنانی تاقەرۆژیکیش دادەمێنی.

**رو مسخرگی پیشه کن و مطربی آموز**

**تا داد خود از مهتر و کهتر بستانی**

واتە: برۆ گاڵتەو هەرزەیی بگرە پیش‌و سازو سەمافێر بە تامافی خۆت لەگەورە وپچوك بستێنی.

کە وابوو، گەلی ئێران تەواویان دوژمنی زانست‌و دژی خوێنەری‌و فێر بوون‌و لەهەر جێگەیەك کتێب‌و کتێبخانەیان دەس کەوێ، ئاوری تێ بەر دەدەن و بەپێچەوانەی ئەمە، لایە نگری گاڵتەو گەمەو سەیرو سەمان؛ یاخۆ بڵێن «ابوحیّان تَوحیدی» بەهۆی هەژاری و دەس تەنگی تەواوی کتێبەکانی خۆی سووتاند، کەوابو، خەڵکی وڵاتی ئەو دوژمنی زانست‌و خوێنەرین.

## کتێب سووتانی خوارەزم

ئەمما دەلیلی پێنجەم ـ یانیٚ ئەوەی ئـەبو ریحـان سـەبارەت بەخـوارەزم گێراویەتەوە، هەر چەند پاڵی بەمەدرە کێکـەوە نەدادەو بیٚ بەڵگـەیەو ئـەبوریحـان سەنەدێکی نیشان نەداوە، بەڵام لەبەر ئەوە ئەبو ریحان پیاوێکە کە جگە لە زانیاریە کانی دیکـەی لە مێژو دا، لێکـوڵەرە وەیە. و قسـەی خـۆرایی ناکا، و لەگەڵ کارە ساتەکە ماوە و نێوانێکـی زەمانی زۆریان نەبوە؛ چـونکە ئـەو، لەنیوەی دووەمی سەتەی چـوارەمو نیوەی هەوەڵی سـەتەی پێنجـەمدا، ژیاوەو خـوارەزم لە زەمانی (ولیدبن عبدالملك) نزیکەی ساڵی ٩٣ گیراوەو جگـە لەمە، بۆخـۆی خـەڵکـی خوارەزم بوە، دوورنیە دروست بیٚ.

ئەوەی ئـەبو ریحـان گێراویە تەوە، یەکەم سـەبارەت بەخـوارەزم و زمانی خوارەزمی بوە، نەك بە کتێبەکانی ئێرانی کە بەزمانی پەهلەوی یا ئەوێسـتایی بوە. دووەم ـ ئەبو ریحان بۆخۆی لە سەرەتای کتێبی «صیدلة» یا «صیدنە» ـ کە هێشتا چاپ نەکراوە ـ لەبارەی زمانەکانو لیٚهاتویی ئـەوانە، بۆ دەربرینی مەبەسـتەکانی زانستی باس دەکاو زمانی عەرەبی، لەبەرانبەر فارسیو خوارەزمی بە چاکتر دەزانیٚو بەتایبەت سەبارەت بەزمانی خوارەزمی ئەڵیٚ: «ئەم زمانە بە هیچ چەشـنێك توانایی ئەوەی نیە مەبەستە زانستیەکان بەیان بکاتو ئەگەر ئینسـان بیەویٚ مەبەسـتێکی زانستی بەو زمانە دەربریٚ، وەك ئـەوە وایەکە و شـترێك لەسـەر لوو سـاوك رابویسیٚ[١].

بەم هۆیەوە، ئـەگەر بەراسـتی لیزگە کتێبێکـی شـیاوی لیٚ روانین بەزمانی خوارەزمی بوویایە، نە ئەگونجا کە ئەبوریحان تائەم رادەیە، ئەم زمانەی بەزمانێکی ناتەواو بناسێنیٚ. ئەو کتێبانەی کە ئـەبوریحـان ئیشـارەی پیٚ کردوون، دەسـتە کتێبێکی مێژویی بوون، کە کردەوەی قتیبەبن مُسلِم سەبارەت بە خەڵکی خوارەزم، لە دەوری ولیدبن عبدالملك رووی داوە، نەك لەزەمانی «خلفای راشـدین» ئـەگەر داستانەکە رەسەنبیٚو خاڵی لەچـاوو راو بیٚ[١]، ئـەوە کردەوەیەکی دژی ئینسـانی و

---

١) بروانە کتیبی «لیٚ کۆڵینەوە کان لە بارەی ئـەبوریحـانی بیرونی» بڵاوکراوەی دانشکـدەی ئیلاهیات و مەعارفی ئیسلامی، مەقالەی ئاغای مجتبی مینوی.

١) ئاغای دوکتور زەررین‌کوب، لە «کارنامەی ئیسلام»ی رەسەن بوونی چیروکەکەی بە باوەرپیٚ نەکراو زانیوە.

دژی ئیسلامی بوه و دەگەڵ کردەوەی پیاوە سەرکەو توە کانی ئیسـلام کە ئێران‌و رووميان گرتوه و زۆر بەیان هاواڵ‌و هاورێی پێغـەمبەری خـوداو لەژێر هوو دەسەڵاتی ئەو حەزرەتە دابوون، جیاوازی هەیە. لەسەر ئـەو مەبەسـتە، کردەوەی ئەو حاکمە، کە لە خراپترین دەورەکانی خەلافەتی ئیسلامی (دەورەی ئـەمەویان) رووی داوە، ناکرێ بیکـەینە بەرجـەوەندی کردەوەی موسـوڵمانەکانی سـەرەتای ئیسلام کەئیرانیان گرت.

لەو جێگـەیە، کە شـك بۆی دەچـێ کە لە ئێران‌دا، دەم‌و دەزگای زانسـتی‌و کتێبخانە هەبوە، تیسفون، یا هەمەدان، یا نەهاوەند، یا ئیسفەهان، یا ئیستەخر، یا رەی، یا نیشابور، یا ئازەربایجانە، نەك خوارەزم. زمانێکی کە شك بۆی دەچی بەو زمانە کتێبە زانسـتیەکان بوون، زمانی پەهلەوی‌یە، نەك زمانی خـوارەزمی، کەزاراوەیەکی ناوچەیی بوە. لە دەورەی ئیسلام‌دا، کتێبە ئیرانیەکان کە بە عەرەبی وەرگێر دراون، وەك «**کلیله و دِمنه**» بەهۆی «**ابن مقفـع**» و بە شـێك لە «**مَنطِقِی اَرَسـطو**» بەهۆی ئـەو، یا، کورەکەی لە زمانی پەهلەوی، نەك زمانی خوارەزمی، یا زاراوەی ناوچەیی دیکە.

**کریستن سن**، ئەنووسێ:

«**عبدالملك‌بن مَروان**، بریاری دا، کتێبێك لە پەهلوی بە عەرەبی وەرگێرن»[١].

ئەمەی کە بەهێرشـی هێرشـبەرێك، شـوێنەواری زانسـتی زمانێك بە تەواوی لەناوبچێت و خەڵك یەکجاری حاڵەتی نەخوێندەواری و بێسەوادی و بێخـەبەری لە مێژوی رابر دووی خـۆیان بەسـەر دابێ، تایبەتی بۆ زاراوەکانی، بێبەرێنی ناوچـەیی‌یە. ئـاشکرایە کە هیچ کاتێك زمانێکـی بەرگێراوی ناوچـەیی ناتوانێ شێوەی زمانێکی زانستی لێ پەیدابێ و کتێبخانەیەکی خاوەن کتێبی جۆر بەجـۆری پزشکی، ریاضی، طبیعی، نجومی، ئەدەبی، ئایینی، بەوزمانە لێ پێك بێ.

ئـەگەر زمانێك بە رادەیەك لەبەر بڵاوی بگـات، کە بتوانێ کتێبخـانەی بریتی لە زانستی جۆر بەجۆر پێك بێنێ، بەپەلاماریك خـەڵکـە کەی یەکجـاری بەگەلێکـی نەخویندوار ناگۆرێن. هروژمێك لە هروژمی مەغول، ترسـێنەرتر نەبوە. کوشـتاری تێکڕایی بەمانای راسـتەقینە، لەهێرشـی مەغول‌دا خـۆی نیشـان‌دا. کتێبان‌و

---

١) ئێران لە زەمانی ساسانیان‌دا، لاپەرەی ٨٦.

کتێبخـانان ئــاگر دران؛ بەڵام هیچ کاتێك ئــەم پەلامارە ترســێنەرە، نەی توانی شـوێنەواری زانسـتی کە بەزمانی عەرەبیو فــارسی بوون، بەتەواوی لەناو بباو پێوەندی بەرەی دوای مەغول، لەگەڵ پێش مەغول، بپچڕێنێ. چونکە شوێنەواری زانستی بەزمانی عەرەبیو حەتتا بەزمانی فارسی، بەر بڵاوتر لەوە بوو کە بەچـەندین کوشتاری تێکڕایی لەناو بچـێ. کەوابو، ئـاشکرا دەبێ، کە ئــەوەی لەخــوارەزم لەناوچوە، ـ ئەگەر بێتوو ئـەو باسگێرانەوە، بایەخـدار بگـرین ـ جگــە لە هێندێك شوێنەواری ئەدەبیو ئایینی زەردوشتی، کە لە کاکڵەو ناوەڕۆکی ئەم چەشــنە کتێبە ئایینی‌یەش شارەزاین، شتێکی دیکە نەبوە و ئـەبوریحـانیش زیاتر لەمەی نەوتوە. سەرنج دان لەوتەی ئەبوریحــان نیشــان ئـەدا، کە مەبەســتی کتێبەکانی مێژوییو ئایینی‌یە.

# کتێب سووتانی عبدالله کوڕی تاهیر

ئەمما بەڵگەی شەشەم، یانێ چیرۆکی کتیب سـووتانی عبداللەبن طـاهر. ئـەم داستانە شیاوی بیستنەو سەیرو سـەمەرەیە، کە خـوا لێ خـۆشبوو دوکتور موعین، ئەم چیرۆکەی بەناوی بەڵگە یانیشانەیەك لە کتێب سووتانی ئێران بەهۆی عەرەبە سەرکەوتووەکان بەسەر ئێران‌دا هێناویەتی.

**عبداللەبن طاهر ذوالیمینین**، سـەرداری بەناوبانگـی ئێرانی زەمانی مەئمونە، کە فەرماندەری لەشکری خوراسان لەشەری نێوان ئـەمین و مەئمون ـ کورەکانی هارون‌الرشـید ـ بەلایەنگـری لە مەئمون بوو بەســەر عەلی کوری عیســادا ـ کە عەرەبو فەماندەی سوپای عەرەب لایەنگری ئەمین بوو ـ سەرکەوتو «بەغدا»ی گرتو ئەمین‌ی کوشتو، وڵاتی هارون‌ی بۆ مەئمون گرت.

طاهر، خۆی دژی عەرەب بوو، وبە، علّان شعوبی کە لە مەحکەمەی هارون دا، کاری دەکردو کتێبیکی سـەبارەت بە کردەوەی ناحـەزو شـوو رەیی یەکانی عەرەب نووسی بوو، سی هەزار درهەمی جایزە دا[1].

کوری ئەو، کەناوی عبدالله بوو، و داستانی کتێب سووتان دەچێتەوە سەر ئـەو، سەربنەچەکەی طاهریانە. یانێ بۆ یەکەم جـار، بەهۆی ئـەو خـوراسان ســەر بە خویی راگەیاندو دەوڵەتێکی سەر بەخۆی پێك هێنا.

عبدالله وەك باوکی، سروشتی دژی عەرەبی هەبوو. بەو حـاڵەوە، سـەیر بوونی مێژوو سەر سـوورینەری ئیسـلام بروانە! هەر ئـەو عبدالله ئێرانیەی دژی عەرەبە،

---

١) احمد آمین، ضحی‌الاسلام، جزمی یەکەم، لاپەرەی ٦٤.

که له بابەت هێزو توانایی‌یەوە، بە ڕادەیەك گەیشتوە کە لەبەرانبەر خەلیفەی بەغدا، سەر بەخۆیی ڕاگەیاندوە کتێبە ئێرانیەکانی بەر لە ئیسلام، بە بۆنەی ئەوە، کە بەبوونی قورئان تەواوی ئەوانە بێهودەن، ئاگر دەدات.

ڕۆژێ کەسێك هاتە دەرباری عبدالله کوری تاهیر لە نیشابوور، و کتێبیکی فارسی زەمانی پێشووی پێشکەش کرد. کاتێ پرسیان چ کتێبێکە؟ وڵامی داوە: چیرۆکی «وامق‌و عەرزایە» و ئەو چیرۆکە شیرینە، زانایان نووسیویانە تەوەو پێشکەشیان کردوە بە ئەنەو شیروان. ئەمیروتی: ئێمە قورئان دەخوێنینەوە و نیازمان بەو کتێبانە نیە. فەرمایشی خودا و پێغەمبەر بۆ ئێمە بەسە، جگە لەمە ئەم کتێبە ئاگر پەرستەکان نووسیویانەو لە پێش چاوی ئێمە ترۆکراوەو وەلانراوە. دوایە بریاری دا، کتێبەکەیان لەئاو خستو دەستووری دا، لەهەر جێگەیەك لە وڵاتی ژێر فەرمانی ئەو، کتێبێکی بەزمانی فارسی، بەقەڵەمی مەجووس بدۆزرێتەوە، لەناو ببرێت[١].

بۆچی وای کرد؟ من نازانم، شکی زۆر بۆئەوە دەچێ، بەهۆی قین‌و کینەیەك بێ، کە ئێرانیان سەبارەت بە ئاگر پەرستەکان بوویان. بە هەر حاڵ ئەم کارە، عبدالله کوری تاهیری ئێرانی کردی، نە عەرەب. کەوایە ئەم کارە، نە تەنیا بەحیسابی عەرەب، بەڵکە بوعەرەبی سەتەی سێ‌هەمیش ناکرێ دابندرێ، چ بگاتە عەرەبی سەتەی هەوەڵ‌و دەورەی سەحابە.

ئایا ئەکرێ کارێکی عبدالله کردی، بەحیسابی تەواوی ئێرانیان دابنێین کە هەر لەبنەڕەتا، ئەم چەشنە بیرو هەستەیان بوە، کە هەر کتێبێك جگە لە قورئان وە دەستیان بکەوتایە، ئەیان سووتاند؟ ئەم جاریش نەخێر.

کردەوەی عبدالله کارێکی ناحەزبوە، بەڵام ئەمە، بەڵگەی ویستی ئێمەیە کەوتمان ئەو کاتە کە فەرهەنگێك ئەکەوێتە بەر شاڵاوی فەرهەنگێکی دیکە، ئەوانەی شوێن فەرهەنگە تازەکە ئەکەون‌و حەزی لێ ئەکەن، بە چەشنێکی زۆراوزۆرو زیانبار، شوێنەواری فەرهەنگی کەونارایان لەبەر چاو دەکەوێ. ئیرانیان کە لە فەرهەنگی تازەی ئیسلامی زۆر کەوتبوونە شادی و دڵخۆشی، دڵویستیەکیان سەبارەت بە فەرهەنگی پێشینە دەرنە دەبڕی بەڵکە، ئاگادارانە، بۆ لەبیر بردنەوەی

١) مێژوی ئەدەبیاتی مستر براون، جزمی یەکەم وەرگێراوەی عەلی پاشا صالح، لاپەرەی ٥١٠ نەقڵ لە دەوڵەتشای سەمەرقەندی.

ئەو، هەوڵیان ئەدا.

لە ئێرانیان، کردەوەی وەك کاری عبداللە کوری تاهیر، کە سەرەرای بێزهاتن لە خۆ خۆشەویستی عەرەب، ئەیەوێ بەناوی هاورەگەزیو هاوخوێنی، خۆی بەسەر خەڵكدا، داسەپێنێ، سەبارەت بە ئیسلام تاسۆیان نیشان داوەو ئەم تاسۆیەیان لەدژی شوێنەواری مەجوو سایەتی بەرێوە بردوە، زۆر ئەبیندرێ.

## کتێب سووتان لە مێژو دا

ئەگەر مەبەست ئەمەیە کە کتێب سووتانی عبداللە کورِی تاهیر بە بەڵگە بگرنو بڵێن ئەم چەشنە کردەوە، لە دنیادا پێشینەی هەیە؛ پێویستی بەم جۆرە بەڵگە گرتنە نیە. دنیازۆر کەرەت کتێب سووتانی دیوەو ئەبینێ. لەزەمانی ئێمەدا، احمد کسروی جێژنی کتێب سووتانی هەبوو. مەسیحی یەکان لە بەسەر هاتی دڵتەزینی أندلُس و کوشتاری تێکرایی موسوڵمانان‌دا، هەشتا هەزار کتێبیان لە ئاگر خست[1]. جورجی زەیدان‌ی مەسیحی، ئیقراری کردوە کە خاچیە مسیحی‌یەکان، لە هێرش بردن بۆ سەر شامو فەلەستین سێ میلیون کتێبیان سووتاند[1]. تورکەکان لە میسر، کتێب سووتانیان کرد[2]. سوڵتان مەحمودی غەزنەوی لەشاری رەی، کتێب سووتانی کرد[3]. مەغول کتێبخانەی مەروی ئاگردا[4]. زەردوشتی یەکان لە دەورەی ساسانی‌دا، کتێبخانەی مەزدەکیە یان سووتاند[5]. ئەسکەندەر، کتێبە ئێرانیە کانی ئاگردا[6]. رووم نوسراوەکانی ئەرەشمیدوس ریاضی‌زانی بەناوبانگی کردە خۆراکی ئاگر[7]. لە دوایی‌دا، سەبارەت بە ئاورتێبەر دانی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە،

---

١) مێژوی ئەندەلوس ، نووسراوی خوالێ خۆشبوو موحەممەد ئیبراهیم ئایەتیو مێژوی شارستانیتی ئیسلام، جورجی زەیدان، وەرگێراوەی فارسی، جزمی ٣، لاپەرەی ٦٥.

١) مێژوی شارستانێتی، جزمی ٣، لاپەرەی ٦٥.

٢) مێژوی شارستانێتی ویل دورانت، جزمی ١١، لاپەرەی ٢٢٤.

٣) جورجی زەیدان، مێژوی شارستانێتی ئیسلام، جزمی ٣، لاپەرەی ٦٦.

٤) ویل دورانت، مێژوی شارستانێتی، جزمی ١١، لاپەرەی ٣١٥.

٥) کریستن سن، ئێران لە زەمانی ساسانیان‌دا، لاپەرەی ٣٨٥. دیسان شارستانێتی ئیرانی، نووسراوی کۆمەڵێك لە روژ هەڵات ناسان.

٦) الفهرست، ابن الندیم، چاپی قاهرە، لاپەرەی ٣٥١.

٧) الفهرست، لاپەرەی ٣٨٦.

بەدەستی مەسیحی یەکان باس ئەکەین.

جورج سارتون، لە مێژوی زانستدا، ئەڵێ:

«پروتاگوارس سوفستائی یونانی، لەیەکێك لە کتێبەکانی خۆیدا، سەبارەت بە حەق‌و حەقیقەت باسی کرد و وتی: وە ئەمما، خوداکان ناتوانم بڵێم هەن‌و ناتوانم بڵێم نین. زۆرشت هەن کە ئێمە لەتێگەیشتنی ئەم مەبەستە ئەگێرنەوە. یەکەمینی ئەوانە، روون نەبوونی خودی مەبەستەکەیە. ئەوی دیکە ئەمەیە: کە ژیانی مروف کورتە»[1].

سارتون ئەڵێ:

«هەر ئەم مەبەستە، بوە هۆی ئەمە کە کتێبەکانی ئەو، لە ساڵی چوار سەت‌و یازدەی بەرلە زایین، لە ناوەراستی مەیدانی شاردا، ئاگردران و ئەمە، یەکەم نموونەی نووسراو سەبارەت بە کتێب سووتان لە مێژودایە»[2].

## بەرگری لە بەرهەم هێنان‌و کتێب نووسین لە لایەن خەلیفەی دووەم

وە ئەمما، دەلیلی حەوتەم، یانێ چیروکی بەرگری لێ کردنی پێك هێنان و کتێب نوسین لە جیهانی ئیسلامدا، کە لە هەوەڵەوە، بەهۆی خەلیفەی دووەم ڕاگەیەندرا و تاسەت ساڵ درێژەی خەیاند. ئەم چیروکەش شیاوی بیستنە، هەرچەند ئێمە، لە بەشی سێهەمی کتێبی خزمەتە کانی ئیسلام‌و ئێران بەیەکتر، بەباسی خزمەتەکانی ئێرانیان بە ئیسلام راگەیشتووین؛ لە بەشی خزمەتەکانی فەرهەنگی، لەژێر سەردێری: «پێك هێنان‌و کتێب نووسین لە کەیەوە دەس پێکرا»؟ ئەم مەبەستەمان روون کردوتەوە.

بەڵام ناچارین لێرەدا، ئیشارە بکەین کەئەوەی نیسبەتی ئەدەن بە خەلیفەی دووەم سەبارەتە بە نووسینەوەی فەرمایشەکانی پێغەمبەر.

لەسەرەتای ئیسلامەوە، لە نێوان عومەرو کۆمەڵێك لە سەحابە لە لایەك‌و، عەلی و هێندێکی دیکە لە لایەکی تر، سەبارەت بە کۆ کردنەوەو نووسینەوەی فەرمایشەکانی پێغەمبەر (ص) جیاوازی بڕوا بوە.

---

١ و ٢) مێژوی زانست، وەرگێراوی، ئەحمەدی ئارام، لاپەرەی ٢٧١.

دەستەی یەکەم کە عومەر لەسـەرەوەی ئـەوان بوو، گویٚ لیٚ گرتن‌و راگرتن‌و گیٚرانە وەی فەرمایشەکانی پیٚغەمبەری بیٚبەرگری ئەزانی، بەڵام نووسـینەوەو پیٚك هیٚنانی ئـەمانەیان پیٚ ناحـەز بوو. بەڵیٚ، ئـەمەش بۆ تیٚبینی ئـەمە بوو کە مەبادا، لەگەڵ قورئان ئاڵ‌و گۆر بکـریٚ. یا سـەرنج‌دان‌و روانین بە حـەدیس، جیٚگـای روانین‌و شویٚن کەوتنی قورئان بگریٚتەوە.

بەڵام دەستەی دووەم کە عەلی لەسـەرە وەی ئـەوان بوو، هەرلە هەوەڵەوە، بۆ نووسیٚنەوە وکۆ کردنەوەی فەرمایشە کانی پیٚغەمبەر (آحادیث نَبوی) دنە دان وهان دانی دەکرد.

عامّە شویٚن بروای خـەلیفـەی دووەم کەوت‌و تا یەك سـەتە، دەسـتی نەدا بە کۆکردنەوەو نووسینەوەی حەدیس.

بەڵام دوای یەك سەتە، عامەش لە بروای عەلی، پەیرەویان کرد.

کەوایە، مەبەست ئەمەنیە، کە بەر هەم هیٚنان‌و نووسینی کتیٚب لەناو عەرەبدا، بەپتوونی و سەبارەت بەهەر مەبەستیٚك بەرگری لیٚکرابیٚ‌و نەتیجـە بگـرین‌و بلیٚین گەلیٚکی کەبە خۆیان ئیجازەی نووسین‌و پیٚك هیٚنانی کتیٚب نەداوە، بەلائـی زیاترە وەش، نووسراوەکان‌و کتیٚبەکانی خەڵکی دیکەیان لەناوبردوە.

ئەمەی کە بەرگری لیٚ کراوە، یا بە ناحـەز زانراوە، سـەبارەت بە حـەدیسـی حەزرەت بوە، نەك شتیٚکی دیکە.

# وتەی جورجی زەیدانو دوکتور سەفا

جـورجی زەیدان لە مێژوی شـارستانێتی ئیسـلامو دوکتور ذبیح‌الله صـفا، لە مێژوی زانستە کانی عەقلی لەئیسلامدا، و تارێکیان لەم بارە وە، هەیە کە حـەیفـە لێکی نەدەینەوەو نەی گێڕینەوە، دوکتور سەفا ئەنووسێ:

«بڕوای عەرەب وەکوو بڕوای هەموو موسوڵمانان، ئەوە بوو، کە «**إنّ الاسلام یهدم ماقبله**» واتە: (ئیسلام بەر لەخۆی خاپوور ئەکا) وهەر بەم هۆیەوە، واچـوو بووە بڕوا ومێشکی موسوڵمانانەوە، کە جگەلە قورئان نەڕواننە شتێکی‌تر، چـوونکە قورئان بە تاڵکەرەوەی هەموو کتێبێك و ئیسلام بە تاڵکـەرەوەی هەموو ئـایینێکە. پێشەوا کانی ئایینی، خـویندنەوەی هەرکتێبێك و حـەتتا هەر کتێبێکـی ئـایینی‌یان جگە لە قورئان قەدەغە کرد بوو.

ئـەڵێن ڕۆژێك، پێغـەمبەر (ص) لەدەسـتی عومەر دا، پەڕێك لە تەوڕاتی چـاو پی‌کەوت، وەها توو ڕەبوو، کە نیشـانەی تووڕەیی لە ڕووی‌دا، خـۆی نواند و ئـەو کاتەوتی:

«**الم آتکم بهـا بیضـاءِ نقیة والله لوکان موسـیٰ حیاما وسـعه الاّ اتباعی**» واتە: (ئایا ڕێو شوێنێکی گرشەدارو خاوێنم بۆ ئێوە نەهێنا؟ سوێند دەخۆم بەخودا، ئەگەر مووسا بۆخۆی زیندوو بوایە، ڕێگەیەکی جگە لە شوێن کەوتنی من نەبوو).

وە هەر وەها، بەو سونگە وەبوو، کە پیغەمبەر فەرمووی:

«**لا تصـدقوا اهل الکتاب ولا تذبوهم وقــولوا آمنّا بالذی أنزل علینا وانزل الیکم ولهنا والهم واحد**».

واتە: (ئـەهلی کتێب، لەوانەی بەناوی ئـایین ئـەی‌ڵێن، نەبڵێن وایە، نەبڵێن

درۆیه، بڵێن: بەوانەی بۆ ئێمەهاتۆته خـوار، وبەوانەی بۆئێوه هاتوه ـ نەئـەوەی له خۆوه دروستتان کردوه بڕوامان هەیه، خوای ئێمەو ئێوه، یەکێکه).

یەکێك له حەدیسەکانی بەناوبانگی ئەو زەمانه، ئەمەبووکه: **کتاب الله فیه خبر ماقبلکم ونبا مابعدکم وحکم مابینکم.**

واته: (لەکتێبی خـوا دا، سـەر گوزەشـتەی پێشـینیان، تیٚبینی داهاتووی ئێوه، ویاسای بڕیار دەر، لەنێوان ئێوه داهەیه).

ڕاگەیاندنی قورئانی پیرۆز، بەم ڕاستەقینه، که:

**لارطب ولایابس الاّ فی کتاب مبین.**

(تەڕ، وەیا، ویشکیەك نیه، جگه له وەی لەکتێبێکی ڕووناك کەرەوه دا، هەبێ).

به تەبیعەت، ئەبوه هۆی پتەو بوونی ئەم چەشـنه بڕوایه و، ئـاکامی ئـەم باوەڕەش ئەبوه قنیاتو بەسەکردن بەقورئانو حەدیسـەکانو چـاو پۆشـین له هەموو کتێبو ئاسار و....[١].

**ڕەخنه**

من بەڕاستی لەم پیاوه گەورانه سـەرم سـوور ماوه. ئـایا ئـەمانه نازانن که، کورتەوتەی **الاسلام یهـدم ماقبله،** مەبەسـتی ئـەوه بوەو ئـەمەیه، که بەهاتنی ئیسلام، تەواوی یاساکانو نەرێتانو خده کانی ڕابردوو، بەتاڵن؟.

تەواوی موسوڵمانان لەسەرەتای ئیسـلامەوه تائێسـتا، لەم کورته وتەیه، جگـه لەمەی لیٚ حـاڵی نەبوون. ئـەم جـوملەیه، ڕاگەیاندنی بیٚ بایەخ بوونی نەرێته کانی ئایینی دەورەی جاهلیت ونەزانینی بەر له ئیسـلامه، بگـره لەتەواوی نەزانینەکانی، هاوتاو شەریك دانان بۆ خوا، یا نەزانینی خاوەن کتێبه ئـاسمانیه کانه، وپێوندیەکی لەگەڵ غەیری یاساو نەرێتی ئایینیه وه نیه.

هەر بەو چەشنه، کەمەبەست له جوملەی: **«الاسلام یجبّ ماقبله»** ئەمەیه که ئیسـلام رووی رابردوو، داده پۆشـیو نـاروانێته پیشـووتر، هەروەك گوناحێکـی گەوره، کەئـەگەر له ئیسـلامدا رووبدات، توڵه، یا تاوانی تایبەتی هەیه، ئـەگەر بەهۆی یەکێك بەر له موسوڵمان بوونی رووی دابیٚو ئەو کەسـه دوایه موسـوڵمان

١) دوکتور ذبیح‌الله صفا، مێژوی زانسـته عەقڵیەکان له ئیسـلامدا، لاپەرەی ٣٢ و هەرنزیك بەو وتەیه، له جزمی سیٚهەم له مێژوی شارستانێتی ئیسلام، نووسـراوی جـورجی زەیدان، وەرگێراوەی فارسی، لاپەرەکانی ٥٤ و ٥٥ دا هاتوه.

بیّ، ئیسلام ناروانێته کرده وەی پێشوو تەواوی موسوڵمانان، لەم کورتەوتانه، ئەم مانایانه تیّ گەیون و تیّ دەگەن، ئەمانه لەکویّو مانای له خۆوه دروستکراوی ئەم نووسەرانه، لەکویّ؟!.

هەر بەم جۆره که، وتەی عومەر، بەئاشکرا هاوار ئەکا، که بەرِیّ کراوی خودا، فەرموویەتی: «بەهاتنی قورئان و شەریعەتی ئاخری، تەورات‌و شەریعەتی مووسا، بەتاڵه» کەوایه پێغەمبەر، خوێندنەوەی هەر کتێبێك حەتتا کتیبی ئاینی بەرگری نەکردوه وبەتایبەت خوێندنەوەی کتێبەکانی ئاسمانی بەتاڵ بووی قەدەغه کرد؛ ئەو حەزرەته، بۆئەوەی موسوڵمانان شەریعەتەکانی بەتاڵبووی رابردوەکان، دەگەڵ شەریعەتی ئیسلام تێکەڵ نەکەن، ئەوانی له خوێندنەوەی تەورات مەنع فەرموه.

ئەوەی که پێغەمبەر فەرموویه: «ئەوانەی، له ئەهلی کتێب ئەی بیستن، نەبڵێن راستەو نەبڵێن درۆیه»ش، سەبارەت به چیرۆکەکانی ئاینی‌و، رەنگه شەریعەتەکانی ئاینی بێت. ئەو حەزرەته، بەم کورتەوتانه، بەئەوانی راگەیاند، کەلەدەستی خاوەن کتێبەکان دا، راست‌و درۆ، پێکەوه لێك دراون، چونکه ئێوه، پسپۆرو لێك جیا که رەوەنین، مەڵێن وایه، که مەبادا بروا پیّ کردنتان به درۆیەك دەربری بیّ. وەدرۆیان مەخەنەوه، نەکا راستیەك وه درۆخەنەوه. هەر وەکوو جوملەی: «له قورئان‌دا، چیروکی پێشینیان، تیّبینی داهاتو، قانون‌ی حاکم لەنێوان ئێوەیه» که له نهج‌البلاغەش دا هاتوه، برێتی له چیرۆکەکانی ئاینی‌و تیّبینی پاشەرۆژو قیامەت، نەرێتەکانی ئاینی‌یه و مەبەست ئەمەیه، کەبەهاتنی قورئان ئێوه کتێبی ئاسمانی دیکەتان پیویست نیه.

له هەموان پێکەنین هێنەرتر وسەیرتر، پێوەنووسان‌و بەدەستەوه گرتنی ئایەی «**ولا رطب‌و لا یابس الاّ فی کتاب مبین**» که تا ئەو جێگەیەی من لێی شارەزام، یەکێکیش له مانا لێده رەوه کانی قورئان، مانای ئەو ئایەتەی سەبارەت به قورئان نەزانیوه، هەموو ئەوەیان به، لوح محفوظ مانا لیّ داوەتەوه.

بروای موسوڵمانەکان لەم ئایەتەو لەو حەدیسانه، هیچ کات ئەو شته نەبوه که ئەم ئاغایانه، به گۆتره دایان ناوەو نەتیجەو ئاکامیان لیّگرتوه که گۆیا، ئەم ئایاتەو ئەو حەدیسانه، موسوڵمانەکانیان بۆ باری بیر کردنەوه، وابار هێناوه، که جگه له قورئان هەر کتێبێك لەهەر لیّزانین‌و له هەر زانستێك بیّ، لەناو بەرن!!.

## وتەی ابن خلدون

ئێستە نۆبەی ئەوەیە، کە بپەر ژیینە سەر لێ کۆڵینەوەی دەلیلی چوارەمی خوالێ خۆشبوو دوکتور موعین. ئـاغای دوکتور موعین ـ هەڵبەت لەزمانی پور داودەوە ـ بەچـەشـنێکی گێراوەتەوە کە ئـەڵێی **ابن خلدون** بەرژدی سـەبارەت بە کتێب سووتانی ئێران بڕوای دەربڕیوە، و ئـەڵێی لە نەقڵی **ابوالفـرج ابن العبری و عبداللطیف بغدادی و قفطی** و **حاجی خلیفە**ش دا، هیچ چەشنە ئـاڵۆز و بڵۆزی و رەخنەیەك نیە؛ لە حـاڵێکا، ئـەوانە، یەقین زانیویانە کە لێکۆڵەرانی ئـوروپایی بە جوانی روونیان کردۆتەوە کە ئەو قسەی کە ئـەڵێن کتێبخـانەی ئـەسکـەندەرییە، بەهۆی موسـوڵمانان ئـاگر درابێت، بنچینەو بناغەیەکی نیە. بەڵام ئـەوان تەنیا، بەنەقڵی وەدرۆ خسـتنەوەی شـبلی نُعمان و مینوی قنیاتیان کردوە. بەبێ ئـەوەی کەبە بەڵگە پتەوە کانی شبلی نعمان و مینوی بروانن.

ئێسـتا ئێمە بەکورتی بیرو بروای لێکـوڵەرەوەکان سـەبارەت بە کتێبسـووتانی ئەسکەندەرییە، لەگەڵ ئەو مەبەستانەی کە بە بیری خـۆم دا هاتوە، ئـەگێرینەوە. لەدوایی دا، ئەپەر ژیینە سەر، لێك دانەوەی ئـەوانەی ابن خلدون و حـاجی خلیفـە لەبارەی کتێب سووتانی ئێران بەسەر موسوڵمانیان داهێناوە.

# کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە

زیاتری هەڵویستەکانی کتیب سووتانی ئێران، کتیب سووتانی ئەسکەندەرییە بە بەڵگە ئـەگرن. ئـاشکرایە کە ئـەگەر لەکاتی نەخـوێندەواری عەرەبی (دەورەی نەزانین)دا، تاقمە قورەیشیەك، مامۆسـتایی لەبەر چـاو سـووك بوە، ئـەگەر کتێب سـووتاندنی عبداللە کوری تاهیر و کتێب ئـاگر درانی خـوارەزم، بەهۆی قتیبەبن مُسلِم لەسەت ساڵ دوای وڵاتگرتنەکانی سەرەتایی ئیسلام، دەبێتە بەڵگە بۆ کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە بەدەستی عەمری کوری عاس، کە بلیمەتێکی تێگەیشتوو وخاوەن هۆش بوە وهەر بەپێی ئەو نەقڵانە، لەلای فیلسوفی ئـەو زەمانە لەشـاری ئەسکەندەرییە، بەهرەی گرتوە و لەگەڵ ئەو هاتو چـۆی بوە. ئـەویش بەفـەرمانی راستەو راستی خەلیفـە لەمەدینە را بوە، نەك لەخـۆرا، (هەر وەك ئـەوەی قتیبەبن مسلم لە خوارەزم کردی) بە چەشنی شیاوتر، ئەکرێ ببێتە دەلیلی کتێب سـووتانی ئێران. هەر بەم هۆیە، وەیە، هەمیشـە لەلایەن ئـەم تاقمانەوە، کتێب سـووتانی ئەسکەندەرییە، بەتامو خوێ، و چاووڕاوەو، ئەیگێڕنەوە.

## سەرەتا وچلۆنایەتی نەقڵی کتیب سووتانی ئەسکەندەرییە

پێشـەکی ئـەبێ بڵێین کە مێژوی ئیسـلامو وڵات گرتنەکانی ئیسـلامی، چ بەچەشنی گشتیو چ سەبارەت بە ناوچـەیەکی تایبەت، لەئـاخرو ئـوخری سـەتەی دووەم دا، نووسـراوە، و ئـەو کتیبانەمان بەدەسـتەوەن. سـەبارەت بە گرتنی ئەسکەندەرییە، بە تایبەتی جگە لە مێژو نووسـانی ئیسـلامی، چـەند کەسـێکی مەسـیحیش، گرتنی ئـەم شـارە، بەدەسـتی عەرەبە کانیان زۆر بەدرێژە، گێراوە

تەوە. لە هیچ کام لەکتێبەکانی ئیسلامی، یا مەسیحی، یا مووسایی‌و هی‌دیکـە، کە بەرلە شەرەکانی سەلیبی نوسـراون، نیوێك لە کتێب سـووتانی ئـەسکـەندەرییە، یائێران لە ناودا نیە. تەنیا لە ئاخرو ئوخری سەتەی شەشەمی کۆچی‌و سەرەتاکانی سەتەی حـەوتەمە، کە بۆ یەکەم جـار **عبداللطیف بغـدادی**، کە پیاوێکـی مەسـیحی‌یە، لەکتێبێك‌دا بەناوی «**الافـادة والاعتبار فـی الامور المشـاهدة والحوادث المعاينة بارض‌مصـر**» کە سـەبارەت بەو کارە سـاتانەو ڕوو داوانەیە، کەبوخۆی دیتویە وبەڕاسـتی سـەفـەر نامەیە، لەو جێگـایە کە کوڵە کەیەك هەیە وناوی «**عمودالساوی**»یە، و لەحاندی پێشـووی کتیبخـانەی ئـەسکـەندەرییە هەڵکەوتوە، باس ئەکاو ئەڵێ:

«ئەڵێن کە ئـەم کوڵەکە، یەکێك لەو کوڵە کانەیە، کە هوٚدەو هەیوانێك لەسـەر ئەوان دامەزرابوو، **وارسـطو** لەم هەیوان‌وهوٚدە دا، دەرسـی وتوە وئـەو جێگـایە شوێنگەی زانستبوە. لەم جێگەیە، کتێبخانە یەك بوە کە عەمری عاس بەفەرمانی خەلیفە ئاوری تێ‌بەر داوە».

**عبداللطیف** نەی‌ویستوە زیاتر لەمە بڵێ کە لەزمان خەڵك ڕا (ناچار مەبەستی لە وشەی، خەڵك، هەر مەسیحیە هاو ئایینەکانی خـوٚیەتی) شـتێکی وا، بڵاو بوٚتەوە، بەبێ ئەوەی بیەوێ لەسەر ئەم چاووڕاوە، سـووربێ‌و بڕوای لەسـەر دەربڕێ، یاوە دروٚی خاتەوە، چـونکە وتەی خـوٚی بە وشـەی «يذكَر»یانی (وائـەڵێن) (وا، کەوتوٚتەسەر زمانان) دەس پێ کردوە.

هەموو ئەزانین کە لەگێڕانەوەی وتەی مێژویی یا حـەدیسـی دا، ئـەگەر ئـەو کەسەی وتەکە ئەگێڕێتەوە، بەڵگـەی هەبێ، مەبەسـتەکە دەگەڵ ناوبردنی بەڵگـە ئەگێڕێتەوە. بەو چەشنە کە **طَبَری** لەمێژو نووسەکان و هەر وەها، زوٚر بەی حديث ناسەکان ئەی کەن‌و باشترین چەشنی نەقڵ گێرانەوەیە، کە بە خوێنەر ماوە ئەدات سەبارەت بە ڕاست یا درو بوونی نەقڵەکە، بکوڵێتەوە و ئەگەر بەڵگەکەی پێ‌ڕاسـت و باوەر پێ‌کراو زانی، قبووڵی کات. وە ئـەگەر باسگێروە بێ بەڵگـە و بێ بنچو بناوان، شتێك بگێرێتەوە، دوو جوٚرە. کاتێ بەچـەشـی (**أرسـالُ المُسَـلَّمْ**) یانی وابگێرێتەوە:

١ـ لە فلانسالێ دا، فڵان ڕوو، داوە، بەدی‌هات.

٢ـ هێندێ وەختیش ئـەڵێ: وایان وتوە، یا وتوویانە، یا وا ئـەگێرنەوە، کە

لەفلانسالّدا، فلان ڕووداوە بەدی هاتوە.

ئەگەر بەچەشنی هەوەلّ بگوترێ، نیشانەی ئەمەیە، قسە کەر بەو شتەی گێراویە تەوە بڕوای هەیە؛ بەڵام دیارە، خەڵك بەم چەشنە نەقلانە، کە بەڵگەو بنچو بناوانی باوەڕ پێکراویان ناو نەبردوە، بڕوا ناکەن. زانایانی (حَدیث) ئەمُ جۆرە حەدیسانە، بڕوا پێکراو نازانن. لێکۆڵەرەوەکانی ئوروپاییش، ئەو مەبەستە مێژویی یانە، کە بەڵگەیان نەبێو لەسەرچاوەی ئەو باسانە ناوێك نەبرابێ، بێبایەخو بڕوا پێ نەکراویان ئەزانن. ئەو سەرەکەی ئەمەیە، کە ئەڵێن فلانکەس فیسار نەقلی، لە کتێبی خۆیدا نووسیوە، بەڵام بەڵگەو سەر چاوەی باس لێکراوەکەی نیشان نەداوە، یانی بایەخو باوەر پێکراوەیی، مێژویی نیە.

بەڵام ئەگەر، بەشێوەی دووەم بگوترێ کە باسگێرەوە: «ئەڵێن» یا «بەم جۆرە ئەڵێن» یا «ئاوا وتراوە»و وەك ئەوانە، بەشێوەی کاری نادیارو نائاشکرا (فعل مجهول) بیگێرێتەوە نیشانەی ئەمەیە کە حەتتا، وتەوێژ بۆخۆشی بایەخو بڕوایەکی بۆ ئەم باسە، لەبەر چاو نەگرتوە.

٣ـ هێندێ کەس بڕوایان وایە کە، وشەی «قیل»یانی (وتراوە) لە باسگێرانەوەدا، نەتەنیا نیشانەی باوەڕ پێ نەبوونی باسگێروەیە، ئیشارە بەبێ بایەخی باسەکەشە. عبداللطیف داستانەکەی بەشێوەی سێهەم گێراوەتەوە، کە بەلانی کەمەوە، بۆ خۆیشی باوەڕی پێی نەبوە.

## قەرینە و نیشانە یەك، بۆ بێ بایەخی نەقلی عبداللطیف

جگە لەمانە، لە بڕوا، دوورە کە عبداللطیف هێندە بێخەبەر بووبێت کە نەی زانیبێ ارسطو پای نەناوەتە میسرو ئەسکەندەرییە، تا لەو هەیوانو هۆدەیە، دەرسی گوتبێتەوە. بەڵکە ڕاستیەکەی ئەمەیە، کە ئەسکەندەرییە، دوای اَرَسطو دروست کراوە؛ چونکە ئەسکەندەرییە دوای هێرش بردنی ئەسکەندەر بۆ میسر، دروستکرا. نەخشەی ئەم شارە، لەزەمانی ئەسکەندەر دارژا و، بگرە هەر لەزەمانی ئەویشدا، دەس بە دروستکرانی کراوە، وکەم کەمە شێوەی شاری لێ پەیدا بوو. **اَرَسطو**، هاو زەمانی ئەسکەندەر بوە.

کە وایە، **عبداللطیف**، چ بۆ خۆی باوەڕی بەم نەقلە بوو بێت، یانەی بوبێ، ئەمە لەباری ناوەڕۆکی مەبەستەوە، کەمایەسی هەیە. یانێ بریتی لە مەبەستێکە، کە

لەڕواڵەت مێژویی یەوە، سوور درۆیە، وئەویش دەرس گوتنەوەی ارسطو لە ڕەواق‌و هەیوانەکەیە.

ئەگەر نەقڵێك‌و باسێکی کە ئەیگێڕنەوە، بریتی بێ لەچەند مەبەست‌و هێندێکیان سوور سوور دەلەسە بن، نیشانەی ئەمەیە کە ئەوانی دیکەش، لەو چەشنەن. سووتانی کتیبخانەی ئەسکەندەرییە، بەدەستی موسوڵمانان لە ڕواڵەت باوەر پێکراوەیی، وەك دەرس وتنی **ارسطو** لەو شوێنەیە.

پەس، ئەو باسەی **عبداللطیف** گێراویە تەوە، هەم لەباری بەڵگەوە، کە لەلاو، بێهێزە، چونکە سەنەدو بەڵگە یەکی نیە؛ هەم لە ڕوانگەی مەبەستەکە، باوەر پێ نەکراوە، کە بریتیە لە درۆ و دەلەسەیەکی ئاشکرا. هەم سەبارەت بە شێوەی باس لێ کردن، شك هێنەرە، چونکە بە چەشنێکی وتوە، کە نیشان ئەدا، بۆخۆیشی بروای پێی نیە.

## لێك دوور بوونی زەمانی باسگێڕەوە، لەگەڵ کاتی بەسەرهاتەکە

سەرەرای تەواوی ئەمانە، ئەگەر عبداللطیف لەزەمانی گیرانی ئەسکەندەرییە دا ژیابا، (سەتەی هەوەڵی کۆچی) وەیا لانی‌کەم، لە چاخ‌و زەمانی ئەو مێژو نووسانە بژیایە، کە سەرکە وتنە کانی ئیسلامی یان - کە یەکێك لە وانە، گیرانی ئەسکەندەرییەیە - لە زمان خەڵك را، بە چەشنی باسگێرانەوە، لە کتێبەکانی خۆیاندا، نووسیوە، (سەتەی دووەم تا چوارەمی کۆچی) ئەو شکەی بۆ دەچوو، ڕەنگە وا هەڵکەوتبێت، کە **عبداللطیف** چاوی بەو کەسانە کەوتبێت کە ئەو کارەساتەیان، بەچاوی خۆیان دیتوە. یا لە کەسانی‌تر، کە دیتویانە، بیستبێتیان و ئەوانیش بۆ **عبداللطیف** باسیان کردبێ (باسێکی دەستی هەوەڵ، یادەستی دووەم یا سیٚهەم) ومێژو نووسی دیکە، چاوی بەو جۆرە کەسانە نەکەوتبێت بەڵام **عبداللطیف** کتێبە کەی خۆی، لە ئاخرو ئوخری سەتەی شەشەم‌و سەرەتا کانی سەتەی حەوتەم نووسیوە.[1] یانێ دەگەڵ بەسەر هاتی گیرانی ئەسکەندەرییە، کە نزیکەی ساڵە کانی ١٧ و ١٨ی کۆچی بەدی هاتوە، نزیکەی شەش سەت ساڵیان

---

١) لە ساڵی ٦٠٣ پێك هێنانی کتیبەکەی تەواو بوو. شبلی نعمان، کتیبیلکەی (ئەسکەندەرییە) لاپەرەی ٢٨.

نێوانە ولە تەواوی ئەو شەشسەت ساڵەدا، لە هیچ کتێبێکی مێژویی و لە زمان هیچ مێژو نووسێك، لە تەوای موسوڵمان‌و مەسیحی‌و موسایی و هی دیکە، نەدیتراوە و نە بیستراوە؛ لە پر و دوای ئەم ماوە، دوور و درێژە، لە کتێبی **عبداللطیف** دا، ئەبیندرێ.

ئەم هۆیە، باسگێرانە وەکەی عبداللطیف لە رادەی باسێکی بێ بەڵگەش زیاتر، ئەخاتە، خواره وە، وبە چەشنی نەقڵێك دێتە دی کە، جگە لە ناوەرۆکی مەبەستەکە، کە درۆیە، لە رواڵەتیشا، درۆ، بوونی ئەم باسە، نیشان ئەدات.

## لەسەرەتاوە درۆ بوونی قسەکە

لە تەواوی ئەوانە گرینگترو بەرچاوتر، ئەمەیە: مێژو شایەدی ئەدات، کە هەر لە بنەرەتا، کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لە چەندین جار دا، بەر لەوە ئەسکەندەرییە بەدەستی موسوڵمانان بگیرێ، کەو تۆتە بەر تاڵان‌و برۆ و ئاگرتێ بەردان. کاتێکی موسوڵمانان ئەسکەندەرییەیان گرت، لەریشەوە کتێبخانە یەك بەچەشنی پێشوو نەبوو؛ تەنیا ئەو کتێبانە بوون، کە بەدەست خەڵکەوە مابوون، کە موسوڵمانان لە سەتەکانی دووەم تا چوارەمی کۆچی، لەو کتێبانە کەڵك‌و بارەیان وەر گرتوە. بەراستی دەر دەکەوێت، کە لە بناغەدا کتێبخانەیك نەبوە، تا موسوڵمانە سەرکەوتوەکان ئاوری‌تێ بەردەن.

جاریکی‌تر لێرەدا، ئەو مەسەلە بەناوبانگە وەراست ئەگەرێ کە یەکێك وتی: «ئیمامزادە یەعقوب، گورگ لەسەر مەنارە هەڵی‌دری». یەکی‌تر وتی: ئیمامزادە نەبوو، پێغەمبەر زادە بوو؛ یەعقوب نەبوو، یوسف بوو؛ لەسەر منارە نەبوو، لە بن چاڵاو بوو؛ تازە ئەم باسە هەر لەبنەرەتا درۆیە، گورگ یوسفی هەڵ‌نە دری.

من‌لێرەدا هەو دای وتار، ئەدەمە دەس **ویل دورانت**، مێژو ناسی بەناوبانگی جیهانی، نووسەری مێژوی شارستانێتی (تاریخ تمدّن).

### ویل دورانت ئەڵێ:

«لەو چەند بەڵگانەی، بۆ بێ هێزی ئەم باسگێرانەوە (باسگێرانەوەی عبداللطیف) هەن، ئەمانەن‌کە:

١- بەشی زۆری کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، مەسیحیەکان، لەدەورەی ئوسقوف

«توفینس» له ساڵی ٣٩٢ی زایینی (نزیکەی ٢٥٠ ساڵ بەر لەگیرانی ئەسکەندەرییە، بەدەستی موسوڵمانان) ئاگر درابوون.

٢- له درێژەی پینج سەتە که لەکاره ساتەکە، تا نووسرانی ئەم بەسەرهاتە خەیاڵیە لەکتیبی عبداللطیف دا، نێوان و فاسله هەیە، هیچ کام له مێژو نووسان، لەبارەی ئەوەوە قسەیان نەکردوە، له حاڵێکا که «اوتکیوس»ی مەسیحی، که لەساڵی ٣٢٢ی کۆچی، ٩٣٣ی زایینی، ئوسقوفی گەورەی ئەسکەندەرییە بوە، گیرانی ئەم شارەی بەدەستی عەرەبەکان بە چەشنێکی بەربڵاو نووسیوە. هەر بەم هۆیە، زۆربەی مێژو نووسان بەدی هاتنی ئەم کارەساتە قبوڵ ناکەن وئەم نەقڵە، بە ئەفسانە و چیروکێکی خەیاڵی ئەزانن. لەناو چوونی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، کە وردە وردە رووی داوە، له بەسەر هاتە ناخۆشەکانی مێژویی دنیا بوو[١].

**ویل دورانت**، دەورانی وردە وردەی لەناوچوونی ئەم کتێبخانەی بەدەستی مەسیحیەکان لەمێژوی شارستانیتی‌دا، باس کردوە. ئەوانەی حەز ئەکەن، ئەتوانن بروانن پەراوێزەکانی شەشەمو نۆهەمو یازدەهەمی وەرگێراوەی فارسی، مێژوی شارستانێتی. (تاریخ تَمَدُّن).

گوستاو لوبون، له شارستانیتی ئیسلامو عەرەبدا ئەڵێ:

«سووتانی کتیبخانەی ئەسکەندەرییە، کە دەی هاوێنە سەرشانی سەر کەوتوە کانی ئیسلام، زۆر جێگای سەر سوور هێنەریە، کەچیروکێکی خەیاڵی، چلۆن لەم ماوە درێژەدا، هەروا، بەناوبانگ ماوەتەوە و ئەوەیان بەشتێکی قبوڵ کراو داناوە. بەڵام ئیمرۆ، باتل بوونی ئەم بروایە، روون کراوەتەوە و بەرادەی ئەرخەیانی گەیشتوە کە عیساییەکان بۆ خۆیان پێش ئیسلام، هەر وەك پەرستشگاکان و خودا کانی ئەسکەندەرییەیان بەتەواوی هێزو توانای خۆیانەوە خاپوور کرد، کتێبخانەی ناو براویشیان سووتاندو وەبای فەنایان‌دا؛ بە چەشنێك کە لەکاتی سەر کەوتنی ئیسلام، له کتێبە ناو براوە کان شتێك نەما بوو، تاکرابێتە خوراکی ئاگر.

شاری ئەسکەندەرییە، کە زەمانی دامەزرانی ئەوێ، ٣٣٢ی پێش له دایك بوونی عیسا بەدی هاتوە، تا زەمانی گیرانی بەدەستی موسوڵمانان - یانی تاماوەی هەزار ساڵ - یەکێك له شارە گەورەو گرینگەکان بوە.

---

١) بگرە، نزیکەی شەش، سەتە.

١) مێژوی شارستانێتی، وەرگێراوەی فارسی، جزمی ١١، لاپەرەی ٢١٩.

لە زەمان پاشاکانی **بطالسە**، تەواوی زانایان و فەلسەفە زانانی دنیا، لەم شارەدا کۆ، ببونەوە، فێرگە و کتێبخانەی گەورە یان دامەزراند بوو؛ بەڵام ئەو پێشکەوتنە زانستیانە، ئەوەندەیان دەوام نەهێنا. بەم جۆرە، کە لەساڵی ٤٨ی پێش زایین، روومیەکان بەسەر کردەیی «سەزار» هێرشیان بردە سەر ئەسکەندەرییەو شکستێکی زۆریان بە ژیانی زانستی ئەم شارە گەیاند. ئەگەر چی لەزەمانی پاشایەتی روومیەکان دیسان ئەو شارە، پێشکەوتەوە و گرینگیەکی تایبەتی پەیدا کرد، بەڵام ئەم پێشکەوتنە، بۆ ماوەیەکی کەم بوە؛ چونکە لەناو خەڵکەکەی دا، شەڕو داواو ناکۆکی ئایینی بەدیهات و سەرە رای بەرگری بێرەحمانە و بێ بەزەیی ئیمپراتورەکانی رووم، رۆژ دەگەڵ رۆژ، ناکۆکی پتر دەبوو، تا ئەو زەمانە کە ئایینی مەسیح بوو بە ئایینی رەسمی وڵاتەکە؛ ئەو کاتە «تئودور» بریاری دا، کەتەواوی پەرستشگاکان و پەیکرەکانی خودایان و کتێبخانەکانی بوت پەرستەکان[1] دەگەڵ خاك تەخت کران[2].

---

١) کتێبخانەی بەناوبانگی ئەسکەندەرییە، بەدەستی خەڵکێکی کە ئەوان شەریك دانەر بۆ خوداو، بوتپەرست ئەزانن دامەزرا.

٢) مێژوی شارستانێتی ئیسلامو عەرەب، چاپی چوارەم، لاپەرەکانی ٢٦٣ و ٢٦٥ (بەکورتی).

# مێژولکەی کتێبخانەی ئەسکەندرییە

شاری ئەسکەندرییە، کە ئێستا لەشارە بەناو بانگەکانی میسرە، بەهۆی ئەسکەندەری روومی، چوار سەتە بەر لە دایك بوونی مەسیح، دروستکراوە؛ وەیا بناغەی دارژاوە وهەر لەبەر ئەمە، ناوی ئەسکەندەرییەی بەسەر دابراوە.

جێ نشینەکانی ئەسکەندەر، کە پێی‌یان دەکوتن **(بطالسە)** لەو شارەدا، مووزەو کتێبخانەو لە راستی‌دا، **ئاکادێمی** واتە: فەرهەنگستانیان دامەزراند، کە بەچەشنی ناوچە یەکی زانستی گەورە، بەدی هات. زۆربەی زاناکانی ئەسکەندەرییە، دەگەڵ زانا گەورەکانی یونان، بەرانبەری دەکەن‌و لە بەناو بانگەکانی زانستی دنیان.

ناوچەی زانستی ئەسکەندەرییە، لەسەتەی دووەم‌و سێهەمی بەر لە زایین دەس پێکرا وتاسەتەی چوارەمی دوای زایین درێژەی بوو.

میسر بە تێکرایی، لە دەورەی ئەسکەندەر و جێ نشینەکانی ئەودا، لەژێر دەسەڵاتی سیاسی یونان‌دا بوو؛ لە دوایی، کە شارستانێتی و پێشکەوتی یونان سەرەولێژ هاتەخوار، لە نیوان رووم، کە پاتەختەکەی «رۆم»ی ئێستا لەئیتالیادایە، دەگەڵ یونان شەر دەستی پی‌کرد و رووم بەسەر یونان‌دا زاڵ بوو. میسرو ئەسکەندەرییەش کەوتەژێر دەسەڵاتی سیاسی رووم. دەوڵەتی رووم، نزیکەی چوار سەتە دوای لە دایك بوونی عیسا، بەشکرا بەرووومی لای رۆژ هەڵات، کە پاتەختەکەی قسطنطنیە، ئەستانبولی، ئێستایە، وەرووومی رۆژ ئاوا، کە مەرکەزەکەی، رۆم لە ئیتالیایە.

روومی رۆژ هەڵات، رووی کردە مەسیحییەت‌و مەسیحییەتیش هەم لەسەر شارستانێتی یونان وهەم لەسەر شارستانێتی رووم، شوێنەواری خرابی بەدی هیناو

سەتەکانی ناوەراستی رۆژ ئـاوایی، دەورەی ســەرەو لێژی وئـاڵۆزی زانسـتو فەرهەنگی رۆژ ئاوایی‌یە کانە. نزیکەی ئەوکاتە (لەت کرانی رووم، بەرۆژ هەڵاتو رۆژئاوا) دەس پیٚ دەکا.

دوای ئەوە رووم رووی کردە مەسـیحییەت، سـێبەری ئـەم ئـایینە، کە دەرس کوتنی زانستەکانو فەلسەفەی بەپێچـەوانەی بنەرەتەی ئـایینی مەسـیح ئـەزانیو زاناکانو فەلسەفەزانە کانی بەکافرو ریٚ گومکراوو رێگە گومکەر دادەنا، قورسایی هاویشتە سەر ناوچەی زانستی ئـەسکـەندەرییە و تاڵان کرانەکانو ئـاگردرانەکانی نۆبە بە نۆبەی ئـەم کتێبخـانە، دووبارە دوای هێرشـی سـەزار (لە ٤٨ ی زایینی)، دەستی پیٚکراوە.

**قسـطنطین**ی یەکەم، هەوەڵ ئیمپراتوریکـە کەئـایینی مەسـیحی قبولٚ کرد. **ژوستی‌نین** لەجیٚ نشینەکانی **قســطنطین**، لەســەتەی شــەشــەمی زایینیدا، بەچەشنی رەسمی ناو چەی زانسـتی **ئـاتن**ی بەسـتو بەر لەمەش، لە ســەتەی چوارەم دا، ناوچەی زانستی ئـەسکـەندەرییە، بەسـترابوو، یا تەواو بیٚهێز کرابوو. بەسترانی ناوچەی زانستی **ئاتن**، لە سـاڵی ٥٢٩ ی زایینی بەدیهات، یانی چلو یەکساڵ پێش لە دایك بوونی بەریٚ کراوی گەورەی خـودا، حـەزرەتی موحـەممەد (ص) و هەشتاو یەکساڵ بەر لە بەپێغـەمبەری گەیشـتنی ئـەوان، و نەوەدو چـوار ساڵ بەر لە کۆچ کردنو سەتو پینجسـاڵ پێش وەفـاتی ئـەوانو سـەتو بیستساڵو هیندێك بەر لە گیرانی ئەسکەندەرییە بەدەستی موسوڵمانان.

## شەڕە قسەی مەسیحیەت، دژی ئیسلام

لە تەواوی ئـەمانەی وتمان، روون بوّوە کە ئـەم کتیبخـانە، بوتپەرسـتان دروستیان کردو مەسیحیان لەناویان برد. بەڵام دوای شەرەکانی سـەلیبی لە نێوان مەسیحیان و موسوڵمانان، کە نزیکەی دوو سەت ساڵ درێژەی خـایاند (سـەتەی پێنجەمو شەشــەمی کۆچـی)، مەسـیحیەکان لە لایەك دەگەڵ شـارستانێتیو فەرهەنگی ئیسلامی بوونە ئاشنا و ئـەم شـارستانیەتیە ئـەوانی روون کردەوە و لە لایەکی دیکـەوە، دوای تیٚ شکـانی بەتەواوەتی لە موسـوڵمانان، کینەو رقـی موسوڵمانەکانیان، توند وپتەو، لەدڵی خۆیان گرتو کەوتنە شەرە قسەوە.

ئەوە ندەیان دژی ئیسلامو قورئانو بە رێکـراوی گەورەی خـواو موسـوڵمانان

قسەهەڵبەستو بڵاو کردەوە، کەهۆی شەرمەزاری پیاوە رۆشنبیرەکانی مەسیحیە، لە سەتەی تازەدا، و ئەبینین کە، بۆ تێ هەڵێنانەوەی خراپەی رابردوو، (تکای لێ بوردن، لە پێشگای مُحَمَّدو قورئان)[١] ئەنووسن. چاوو راوی کتێب سووتاندنە کان بەدەستی موسوڵمانان، لە رادەی ئەم چاوو راوانەیە، کە رەنگە هێندێك لە موسوڵمانانیش لە سەتەی حەوتەم بەدواوە، بەبێ ئەوەی تێفکرن کە ئەم چیرۆکە، بەیتو باوێکی بێپایەو بێڕەسەنەو لە گێرانەوەی ئەو، خۆ بپارێزن؛ یا لانی کەم هەر وەك پێویستی «ڕێو شوێنی باسگێرانەوەیە» بەچەشنی «وابڵاو بۆتەوە» یا «وا ئەڵێن» یا «وائەگێرنەوە» لە کتێبەکانی خۆیاندا بگێرنەوە. وا وێ دەچێ، بەچەشنی باسێکی روون کراوەوە، لەکتێبەکانی خۆیاندا نووسیویانە. بێخەبەر لەوەی کە دروستکەرو بەدی هێنەری ئەم بەیتو باوانە، مەسیحی یەکانی سەلیبیو و مەبەستیان بەد ناو کردنی ئیسلامەو لە سەتەی دوایینڕدا، کە ئیستعمار و داگیر کەران، وەتین هێنانی هەستی کۆمەڵایەتی گەلەکانی ئیسلامیان، دژی ئیسلامو موسوڵمانانی سەرەتای ئیسلام، کردۆتە هەوەڵین کاری پیویستی خۆیان، هی وەك پوُر داود، ئەم چیرۆکە خەیاڵیەی بە چەشنی بەسەر هاتێکی مێژویی پێك هێناو، بە باسگێرانەوە کانی وەك باسگێرەویی عبداللطیف پەرو باڵدا و وەك چیرۆکێکی راستەقینەی مێژویی، ئاوێتەی مێشکی قوتابیان و خویندکارانی زانستگایی کرد.

---

١) کتێبێك هەر بەم ناوە «جان دیون پورت» نووسیویە، کە بەهوی ئاغای حاج سەید غولام رەزا سەعیدی بەفارسی وەرگێردراوە. جان دیون پورت لەو کتێبەدا، لاپەرەی ٢٢ مەبەستی کتێب سووتانی ئەسکەندەرییەی باس کردوە، و بەتوندی وەدروی خستۆتەوە.

## وتەی ابن العبری

تائێره، وتەی **عبداللطیف** مان گێراوەو لێكمان داوه، ئێستا دەس ئـەكەین بە لێ كوڵینەوەی وتەی **ابوالفرج ابن العبری.**

ئەو پیاوه، دوكتورێكی جـوولەكەیه، كە لە سـاڵی ٦٢٣ی كوچـیدا، لە **ملیطه** (توركیه) لە دایك بوەو باوكی دەسـتی لە ئـایینی موسـا، بەرداو بوو بە مەسـیحی. **ابوالفرج** سەرەتای دەرس خوێندنی خـوّی، لە فێر بوونی مە بەسـتە بنەرەتیە كانی ئایینی مەسیح را، دەس پیّ كردوه. ئەو لە زمانەكانی سُـریانیو عەرەبی بە تەواوی شارەزا بوو. مێژوێكی بەربڵاو و بەرینی، بەزمانی سـریانی نووسـیوه و لە كتێبەكانی سـریانیو عەرەبیو یونانی، یار مەتی وەر گرتوه. لەم كتێبەدا، باسـێك لە كتێب سـووتانی ئـەسكـەندەرییە نەكراوه، وكورتكـراوە یەك لەم كتێبەی بەعەرەبی، بە ناوی «**مختصرالدّول**» نووسی كە ئەڵێن هەموو جزمەكانی ئەو كتێبه، كەمایەسی هەیەو ناتەواوه؛ سەیر ئەمەیه، كە هەر چەند ئەڵێن **مختصر الدّول**، كورتكـراوەی ئەو كتێبە بەربڵاوە بەزمانی سریانییه، كەچـی لە مختصـر الدول دا، مەبەسـتی وا نووسـراوه، كە لە ئـەسـڵی كتێبە بەربڵاوە سـریانی یەكەدا نیەو یەكێك لەوانه، داستانی كتێب سوتانی ئەسكەندرەییە بەدەستی موسوڵمانانه.

كتێبی مختصرالدّول، پیاوێك بەناوی دوكتور «**پوكوك**» كە پروفسوری كالجی اكسـفورد بوه ولەو كەسـانەیه، كە دەسـتی لە بڵاو كردنەوەی دەلەسـەو دروّ، دژی موسـوڵمانان دا هەیه؛ نووسـیویەو بڵاوی كردوّتەوەو بە زمانی لاتین وەری گێراوەتەوه.

لەو وەختەوەو بەهوّی ئەم كتێبەو ئـەم كابرایه، چـاوو راوی كتێب سـووتاندنی

موسوڵمانان لە ئەسکەندەرییە، بە ئوروپادا بڵاو بۆوە (هەڵبەت بڵاو بوونە وەی ئەم ئەفسانە لە ئوروپا دا، بەهۆی ئەم کتێبە بەدی‌هات، بەڵام ئەسڵی چیرۆکەکە، کە لە پێشدا لەکتێبی عبداللطیف کە لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردو «**اخبار الحكماءِ قفطی**» کە لەمەو دوا، باسی‌لێ ئەکەین‌و لێی دەکۆڵینەوە، نووسرا بوو) هەتاکو لەم سەتە دواییانەدا، بەهۆی لێ‌کۆڵەرەوەکانی ئوروپایی وەك: **گیبون** و **کریل** و **گوستاو لوبون** و هی دیکە، ئەم بەیتو باوە، وە درۆخراوە[1].

داستانی کتێب سووتان لە کتێبی مختصرالدّول دا بەم چەشنە هاتوە:

«لەو زەمانەدا، **یحیی نحوی** ـ کە بە زمانی ئێمە بە «غرما طیقوس» یانێ نحوی ناو ئەبرا ـ لەناو عەرەبان دا، بە پلەی بە رزی بەناوبانگی گەیشتبوو. ناوبراو، ڕۆنیشتووی ئەسکەندەرییە بوە و لەباری ئایینەوە، مەسیحی‌و لە دەستەی یەعقوبی بوە. بەتایبەت بڕوای **ساوەری**(؟) بەچاك دەزانی.

ئەو پیاوە لە ئاخردا، دەستی لە ئایینی مەسیح هەڵگرت‌و ئەگەرچی تەواوی زانایانی مەسیحی میسر، لە دەوری ئەو کۆ بوونەوە، و بەسەری داهاتن‌و ڕێنموو نیان کرد، قبوڵی نەکرد. کاتێ کە زاناکان لێی ناهومێد بوون، ئەویان لەو پایەو پلانەی کە پیێان دابوو، هێنا اخوارەوە و تا ماوەیەك بەو حاڵە ماوە و زیندوو بوو، هەتا عەمری عاس ـ فەرماندەری موسوڵمانان لە گرتنی میسردا ـ هاتە میسر.

ڕۆژێك یەحیا هاتەلای عەمری عاس. عەمر، لە پایەی زانست‌و گەورەیی ئەو تێ‌گەیشت‌و زۆری ڕێزلێ گرت.

زانای ناوبراو، دەستی کرد بەچەشنەو تارێکی حەکیمانەو تێ گەیشتوانە، کە عەرەبەکان شتی‌وایان هەر نەبیستبوو. ئەو وتانە، یەکجار زۆر سەرنجی عەمری بۆ لای خۆی ڕاکێشاو ئۆگری ئەو بوو. بەهۆی ئەوە، عەمر مرۆڤێکی خاوەن هۆش‌و تێ گەیشتووو بیرکەرەوە بوو؛ وت‌و وێژ کردن دەگەڵ ئەو پیاوەی بەباش زانی‌و هیچ کات لە خۆی دووری نەدەخستەوە.

ڕۆژێك یەحیا بە عەمری عاسی وت: هەرچی لە ئەسکەندەرییە دایە، لە ژێر دەسەڵاتی تۆ دایە. دیارە ئەوەی بۆ ئێوە فایدەی هەیە من کارێکم پێی نیە؛ بەڵام

---

١) ئەم بەشە، لە کتێبیلکەی «کتێبخانەی ئەسکەندەرییە» نووسراوی شبلی نعمان، لاپەرەکانی ١٤ و ١٥ و ٣٨، وەرگیراوە.

هێندیٚ شت کە زۆر بۆ ئێوە پێویست نیە، تکا ئەکەم بیان دەن بە ئێمە، چونکە ئێمە زیاترمان پێویستە. عەمر پرسی ئەو شتانە چین؟ لە وەڵاما وتی: کتێبی حیکمەتو فەلسەفەن، کە لە کتێبخانەی دەوڵەتی دا، کۆکراونەوە. عەمر وتی: من لەوبارەوە، ئەبیٚ لەخەلیفە (عومەر) دەستوور وەربگرم، دەنا لە خۆمەوە، ناتوانم کارێك بکەم. بەم چەشنە، ئەو مەبەستەی بە خەلیفە راگەیاندو داوای دەربرینی بروای کرد، خەلیفە لەوە ڵامدا، نووسی: ئەگەر ئەم کتێبانە دەگەڵ قورئان یەك دەگرنەوە، هیچ پێویستمان نینو ئەگەر بەپێچەوانەی قورئانن، تەواوی ئەوانە لەناو بەرە.

دوای گەیشتنی ئەم وڵامە، عەمر دەستی کرد بە خاپوور کردنی کتێبخانەو، ئەمری کرد تەواوی ئەم کتێبانە لە نێوان حەمامەکانی ئەسکەندەرییەدا بەش کرانو بەم هۆیە، لەماوەی شەش مانگدا، تەواوی کتێبە کانیان سووتاندو لەناو بردو ئەوەی بەدی هاتوە، بەبیٚ سەر سوورمان قبووڵی بکە[1]».

**رەخنە:**

بەداخەوە، بەمتکا وپیٚ سپێردانەی جەنابی **ابوالفَرَج** (ئەگەر ئەم بەسەر هاتەی، بۆخۆی پێکیەوە نابیٚ) وەیا، تکاورەجای جەنابی **پروفسور پوکوك**، ئەم چیرۆکە، نە بەسەر سوورمانەوە و نەبەبیٚ سەر سوورمان، شیاوی برواو باوەر پیٚکردن نیە. جگە لەوە، لە لێکۆڵینەوەی وتەی **عبداللطیف**دا، وتمان باسێکی مێژویی کە بیٚ بەڵگە بیٚو لەو سەر چاوەی کە باسەکەی لیٚ وەر گیراوە، ناوێك نەبرابێت، بە هیچ چەشنێك جێگای بروا، نیە. بەتایبەت کە لە دوای شەش سەت ساڵ ئەم نەقڵە بیٚ بەڵگەو بیٚ سەر چاوەیە، دابمەزریٚو بەر لەمە هیچ کەسێك چ بە بەڵگەوەو چ بیٚبەڵگە قسەی لیٚ نەکردبێت؛ جگە لە مەش وتمان کە بروای زاناکانی لیٚکۆڵەرەوە، ئەم مەبەستەیان روون کردۆتەوە، کە هەر لە بنەرەتا، کاتیٚ کە موسوڵمانان ئەسکەندەرییەیان گرت، لە کتێبخانە کە شتێك نەمابوو. باسی کتێب سووتان لە ناوە رۆکەوە، دروستکراوو دەلەسە بوە. بەڵگەو نیشاندەری دیکەشمان دژی ئەم باسە هەیە.

---

١) شبلی نعمان، کتێبیلکەی: کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لاپەرەکانی ١٦-١٨.

**یەکەم ـ یحییٰ نحوی فیلسوفی** بەناو بانگیان کردوّتە قارەمانی ئەم داستانە، لە حالّێکا بەگوێرەی بەڵگەی لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییانە، ناوبراو سەتسالٚ بەر لەگیرانی ئەسکەندەرییە، مردوەو بەیەك گەیشتنی ئەو و عەمری عاس ئەفسانەیە[1].

سەمەرەیەو هۆی واقمانە، کە شبلیٰنعمان هەرچەند ئەنووسیٚ کە نحوی لەو حەوت پیاوە زانایانەیە، کە لەبەر زوڵمو زۆری ژوستینین لە روومەوە هاتنە ئێران‌و، خوسرەو ئەنەو شیروان چاوە دێریو پەزێرایی لیٚکردن، کەچی بروای بەوەش هەیە، کە یەحیاو عەمری عاس، لە ئەسکەندەرییە، یەکتریان چاو پیٚ کەوتوە. ئیتر ناروانێتە ئەمە کە لەسەفەری ئەو حەوت کەسە زانایە بۆ ئێران، تاکاتی گیرانی ئەسکەندەرییە، زیاتر لە سەتو بیستسالٚ ماوەی هەیەو ناگونجیٚ یەحیا ـ کە سەتو بیستسالٚ بەر لەگیرانی ئەسکەندەرییە، حیکمەت زانێکی گەورەو بەناوبانگ بوە ـ کاتی گیرانی ئەسکەندەرییەش، هاو دەمی عەمری عاس بوو بێتو بە ژیانی خۆی درێژە بدات.

جا لەبەر ئەوە ئەو نەقڵانەی کە بەیەك گەیشتنی یەحیاو عەمر دەگێرنەوە، گەرچی ناوێکیان لە کتێبخانە نەبردوە، بیٚ بنچینەو بیٚ پایەن.

چیرۆکی بەیەك گەیشتنی یەحیاو عەمر، بەوتەی **ابوالفَرَج**، وەك دەلەسەی دەرس وتنی **اَرَسطو**. لە ئەسکەندەرییە ئەچیٚ، کە **عبداللطیف** دروستی کردوە. دروستکەرەکانی ئەم چیرۆکەو ئەوانەی گێراویانەتەوە، بەر جەوەندی ئەوەیان نەکردوە بزانن چیرۆکە کەیان دەگەڵ مێژو، یەك دەگرنەوە، یان نا.

---

١) سەیر ئەمەیە، کە ئاغای (دوکتور ذبیح‌الله صفا) هەرچەند لە لاپەرەی ٦ی (مێژوی زانستەکانی عەقلی لە ئیسلامدا) ئەڵیٚ یەحیا نەحوی، لە پیاوە گەورەکانی مەدرەسەی ئەسکەندەرییە، لە ئاخری سەتەی پێنجەمو نیوەی هەوەڵی سەتەی شەشەم (نزیکەی سەت سال بەر لە کۆچی پێغەمبەر) بوە و لە لاپەرەی ١٨ی ئەو کتێبەدا، بە ئاشکرا، رادەگەیەنیٚو ئەڵیٚ: «تاگیرانی میسر بەدەستی عەمری عاس، (٦٤١ زایینی) یەحیا نەحوی زیندوو بوو؛ بەڵام بەم جۆرە کە لەباری وتەی مێژو دەر ئەکەویٚ، ئەم کابرایە لەپیاوەکانی ئاخرو ئوخری سەتەی پێنجەمو نیوەی هەوەڵی سەتەی شەشەمی زایینی‌یە و زیندوو مانەوەی ئەو لە ئاخرو ئوخری سەتەی پێنجەمو ناوەراستی سەتەی حەوتەم، بەتەواوی دوورە لە عادەتو عەقڵ دیارە. لە عەینی حالٚدا، کورتەی ئەو داستانەی کە قارەمانەکانی، یەحیای نەحویو عەمری عاسن، بەناوی دەلیلو بەڵگە بۆ کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە هێناوەتەوە.

**دووهەم** ـ لەناوەڕۆکی چیرۆکەکەدا، ئەڵێ کە دوای ئەوە خەلیفە بڕیاریدا کتێبخانە لەناوچێ، عەمر کتێبەکانی لە نێوان حەمامەکان‌دا بەش کردو ماوەی شەش مانگ کتێب کرانە خۆراکی ئاگری حەمامەکانی ئەسکەندەرییە. هەر بەوەرا، کە ئەسکەندەرییە لەو کاتەدا، گەورەترین شاری میسرو گەورەترین شاری دنیای ئەو وەختەبوە و عەمر بۆ خۆی لە ڕاگەیاندنە کەی‌دا، بۆ خەلیفەباس دەکاو ئەنووسێ:

«لەم شارەدا، چوار هەزار حەمام، چوار هەزار خانوو بەرەی گەورە، چل هەزار جوولەکەی سەرانە دەر، چوار سەت دیمە نگاو گەردشگای دەوڵەتی، دوازدە هەزار سەوزی فرۆش کەسەوزی تازەیان دەفرۆشت هەبوە».

ئەبێ وا لەبەر چاو بگرین کە لەماوەی شەش مانگ‌دا، چوار هەزار حەمام بەو کتێبانە گەرم کراون. یانی کتێب ئەوەندە زۆر بوە، کە ئەگەر بیان‌ویستایە تاقە حەمامێك بەو کتێبانە گەرم بکەن بۆ نزیکەی حەوتسەت هەزار ڕۆژ، یانێ بۆ نزیکەی دوو هەزار ساڵی ئەو حەمامە بەس بوو. سەیرتر ئەمەیە، بەگوێرەی ئەوەی لە ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنە کەی ابوالفرج دا هاتوە، تەواوی ئەو کتێبانە لە باسی حیکمەت‌و فەلسەفەدا بوون نەك مەبەستێکی‌تر.

ئێستەوا چاکە کەمێك بیر بکەینەوە: ئایا لە سەرەتای بەدی‌هاتنی شارستانێتی یەوە هەتا ئەمرۆ ـ کە چەند سەتەیە چاپ دروست کراوەو بە شێوەیەکی سەر سوور هێنەر چاپەمەنی ئەداتە دەرەوە ـ ئەوەندە کتێبی حیکمەت‌و فەلسەفە کە بەرگەی ئاگری چوار هەزار حەمام لەماوەی شەش مانگ دا، بگرێت بوە؟.

دیسان وا باشە بیر بکەینەوە: ئەم کتێبخانەیە، چیهای جێگە داگرتبێت؟!

کتێبەکان ناکرێ بە چەشنی کای کادێن ڕژابنە سەر یەك؛ بەڵکە بەشێوەی ڕێك‌وپێك لە ڕفەدا، هەڵچندراون تا خەڵك کەڵکیان لێ وەرگرن، ئەمەش بزانین کشیشێکی مەسیحی لە سەتەی چوارەمی دوای زایینی‌دا، کە لە لایەن ئیمپراتورەوە، دەستووری پێ درابوو تا کتێبخانەکە لەناو بەرێ بەم جۆرە ڕادەگەیەنێ کە:

«من تەواوی قەفەسەکانی ئەوێم لەو کاتەدا، لە کتێب بەتاڵ‌و حەتاڵ دێت»[1]

تاقە هۆدەو ڕەواقێکی کە ئاغای عبداللطیف لەو جێگایەی دیتوە هیچ کە ئەو

---

١) شبلی نعمان، کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لاپەرەی ٥٠.

کتێبانەی تیٚدا جێگا نابێتەوە، بگرە جێگە شارێکیش بۆ کتێبخانەیەکی ئاوا کەم بوە.

ئیمڕۆ کتێبخانەی زۆر گەورە، بەهۆی پێشکەوتنی سەنعەتی چاپو لە دەس هاتنو دەس ڕۆیشتنی بەر بڵاو، کە بەر لەمە لە مێژوی بەشەر دا، نەبوە، لە دنیادا بە تایبەت لە ئەمریکاو شوورەوی دا هەیە. هەر بەو جۆرە کە شارە زۆر گەورەکان، کە لە مێژوی ژیانی ئینسان‌دا نەبوون، لە دنیای ئەمرۆ دا هەن.

من بروا ناکەم ئیستاش کتێبخانەیەك هەبێ، کە کتێبەکانی ئەوێ بۆ گەرم کردنی حەمامە کانی شارێك کە ئەم کتێبخانە، لە وێدابێ باشار بکات.

ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ ئەوەی ئەم داستانە، خەیاڵی خاوو ئەفسانەیەو تەنیا لە دنیای ئەفسانەدا، یەك نموونەی هەیەو ئەویش ئەمەیە ئەگێرنەوە ئەڵێن: کابرایەك لە تاریفی شاری هراتدا ـ کە دەیگوت زەمانێك یەکجار گەورەو پر حەشیمەت بوە ـ چاووراوێکی زۆری کردو کار گەیشتە ئەو جێگایە کە کوتی:

«... ئەو کاتە لە هرات دا، بیستو یەك هەزار ئەحمەد ناوی یەکچاوی کە لە پاچە فرۆش بوە»!!!.

هەر لە وەی‌را، کە تەواوی خەڵکی شاری هرات، ناویان ئەحمەد نەبوە و تەواوی ئەوانەی ناویان ئەحمەد بوە، قیچو یەکچاو نەبوونو تەواوی ئەحمەد ناوی یەکچاوی ئەو شارەش، کە لە پاچەفرۆش نەبوون، کە وایە ئەگەر ژمارەی ئەحمەدە یەکچاوە کانی کە لە پاچەفرۆش گەیشتبێتە بیستو یەك هەزار کەس؛ حیسابی کەن بروانن ژمارەی چاو ساغەکان چەندە بوون؟!.

ئەگەر تەوای زیندوو مردوی عالەم خڕ کەینەوە، بەوەندەناگا.

داستانی **ابوالفَرَج**یش، شتێکە وەك چیروکی ئەحمەدی یەکچاوی ناوبراو. بە وتەی شبلی‌نعمان، هەر بەم هۆیەوەیە، کە نووسەرانی دایرةالمعارفی ئینگلیسی، چیرۆکی **اَبوالفَرَج** بە گەپو گاڵتە ئەژمێرن.

**سێهەم ـ شِبلی نَعمان** و هێندێك لە لێکۆڵەرەوەکانی ڕۆژئاوا وتویانە: لەو زەمان دا، کتێبەکان لەسەر کەوڵ نووسراون و بە کەڵکی سووتان نەهاتوون ئەوەی کە کتێبان کرابنە دەستە چیلەی ئاگر، کارو بیرێکی بێ هوو دەیە.

**شِبلی نَعمان** لە زمان کابرایەك بە ناوی **مسیوپیر**، تەگێرێتەوە کە وتوویە:

«ئێمە برواهان بەمەیە کە حەمامچیەکانی ئەسکەندەرییە، تا ئەو جێگەیە کە

شتێکیان بۆ سووتاندن دەست کەوتبێت، هیچ کاتێك کتێبی لە پێستە نووسراویان وەبەر ئاگر نە ئەدا. قسە لەسەر ئەوەیە، کە بەشی زۆری کتێبەکانی ناوبراو، لە کەولْ پێك هاتبوون[1].

**چوارەم** ـ ئەگەر ئەو چەشنە کتێبخانە لە ئەسکەندەرییە دا بوایە، بێ‌گومان عەمری‌عاس لەو باس‌و خواسەدا، کە سەبارەت بەوشارە بۆ خەلیفەی نووسیبوو لە مێژوە کان‌دا نووسراوە و راگیراوە، ناوێکیشی لەو کتێبخانەیە ئەبرد. لە راگەیاندنەکەی عەمر دا، باسی گەردشگاو جێگە رابواردنە کانی گشتی دەوڵەتی و سەوزی فرۆشەکانی شار کراوە، بەڵام باسێك لە کتێبخانە نیە.

**پێنجەم** ـ شاری ئەسکەندەرییە، دوای ئەوە کەوە دەست موسوڵمانان کەوت، قەراردادو بریاری ئاشتی دەگەڵ موسوڵمانەکان بەستو خەڵکی ئەو شارە «**أهل ذمّه**» واتە: پەنانشینی موسوڵمانان، ناسران‌و یاسای پەنانشینی بۆیان بەرێوەبرا؛ یانێ گیان‌و ماڵ‌و نامووس‌و حەتتا پەرستشگا و ئازادی بەریوە بردنی نەرێتەکانی ئایینی ئەوان رێزی لێ‌گیراو حکومەتی ئیسلامی چاوەدێری و پارێزگاری ئەوانەی بە ئەرکی سەرشانی خۆی ئەزانی.

عەمر کوری عاس، لە پەیماننامە خۆی‌دا دەگەڵ خەڵکی میسر، بەو چەشنەی نووسی:

«ئەمە پەیمانی هێمنایەتی‌یە، کەعەمر، بە خەڵکی میسری ئەدات. گیان‌و خوێن‌و کەل‌وپەل‌و حەشارگەو شتەکانی دیکەی ژیانیان پارێزراوە». بە گوێرەی ئەوەی **مُعجَمُ البُلدان** گێراویە تەوە روون کراوەتەوە کە:

«زەوی خەڵکی میسر، کەل‌و پەل‌و دارایی ئەو خەڵکە هەمووی هی خۆیانەو هیچ کەس مافی دەس پی‌گەیاندن‌و داگیر کردنی ئەوانەی نیە».[1]

بە تێکڕایی ئەزانین کە کردەوەی موسوڵمانان سەبارەت بەو گەلانەی لە کتێبی ئاسمانی پەیرەویان کردوە (أهل کتاب)، هەمیشە بەم جۆرە بوە کە دوای سەرکەوتن، ئەوانەی بە پەنانشینی خۆی داناوەو ماڵیاتی لێ ساندوون‌و لە بەرانبەر ئەو ماڵیاتە، خۆی بە پارێزەری هێمنایەتی گیان‌و ماڵ‌و ئابروو و پەرستشگای ئەوانە زانیوە. لە ئەسکەندەرییەش بەو چەشنە رەفتار کرا.

---

١) شبلی نعمان، کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لاپەرەی ٥٣.

١) شبلی نعمان. کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لاپەرەی ٥٦.

ئـەگەر لە نەقلی **ابوالفـرَجدا**، بگـوترایە کە موسـوڵمانان کاتی گرتنی ئەسکەندەرییە، بەر لە بەسترانی پەیمانی ئاشتی، سەبارەت بەخەڵك ئـەم چـەشـنە کارانەیان کردوە، لەو بارەوە باسـێکمان نەبوو؛ بەڵام راگەیاندنەکەی **ابوالفـرج** ئەڵێ: ئـەم کارە سـاتە ماوەیەکی زۆر دوای گیرانی ئـەسکـەندەرییە، بەهۆی باسکردنی یەحیا نەحوی هاتۆتەدی و، ئەوەی کە موسوڵمانان دوای بریاری ئاشتی کارێکی ئاوایان کردبێ، پێچەوانەی کردەوەی ئەوانە.

**شەشەم** ـ تا ئەو رادەیەی ئێمە لە ئـەحـوالی عەمرو عومەر شـارەزاین، بروا ناکرێ کارەسـاتی ئـاوا رووی دابێت. بەڵام عەمر، بۆ خـۆی پیاوێکـی بە هۆش‌و تێگەیشتوو سەربەخۆ بوە و ئەگەر بیرو بروایەکی تایبەتی بوویایە، بەهەر چەشـنێك بوایە، بەسەر عومەری دا، دادەسەپاند و دەی کرد.

مێژوەکان ئەنووسن کە عومەر، زۆر مەیلی بەگرتنی میسر نەبوو؛ عەمری عاس بروای خۆی بەسـەر دابری. وەك ئـەڵێن، داخـوازی ئیجـازەی کرد بەڵام بەر لەوە فەرمانی پێگات هرووژمی دەست پێ‌کرد. ئەگەر بەو چەشـنەی چیرۆکەکە ئـەڵێ، کە یەحیا نەحوی ببوە هاو دەمو هاوڵی عەمری عاس‌و، عەمر بەهۆی فامو عەقڵ‌و لێهاتوویی خـۆی، لە وتاری ئـەو زانایە حـەزی دەکردو فـایدەی لێ وەردەگرت، عەمر لەنامەی خۆی‌دا بۆ عومەر، ئەی نووسـی دۆسـتێکی ئـاوا زانای هەیەو ئـەو کتێبانەی بۆ ئەو پێویسـتەو ئـەبێ کتێبخـانە کە بمێنێتەوە. نەك بە داخـوازی ئیجازەیەکی سووك‌و هاسان قنیات بکـات‌و دەگەڵکـوو کاغەزی خـەلیفـەی پێ گەیشت، بەبێ نووسینی نامەیەکی دیکە لە پێش چاوی دۆستی زانای خـۆی، ئـەو کتێبانە ـ کە دۆستە پایە بەرزەکەی لە گیانی خۆی خۆشتر دەویستن ـ ئـاوریان تێ بەر بدات.

جگـە لەمە، کردەوەی عەمر لە ئـەسکـەندەرییە، کردەوەی سـەر کەوتوویەکی وابوە کە حـەزی لە باشکـردن‌و بەر هەم هێنان‌و ئـاوە دان کردنەوە، کردوە؛ نەك چەشنی مل هورێکی زاڵم‌و ستەمکاری وەك **قیتبەبن مسلم**.

**ویل دورانت** ئەنووسێ:

«عەمر، بە دادگەری حکومەتی کرد. بەشـێکی لە ماڵیاتە زەوەندە کەی، بۆ پاك کردنەوەی جۆگە ئاوەکان‌و چاك کردنەوەی پردەکان‌و تازە کردنەوەی درگە ئـاوێك

(کانال) کە لەزەمانی پێشوو، چەمی نیلی تێکەڵ دەریای سوور دەکرد»[١] تەرخان کردو کەشتیان توانیان لە مەدیترانە وە بڕۆنە گەورە دەریای هند. ئەم ڕێگا ئاوە. لە ساڵی ١١٤ی کۆچی (٧٣٢ی زایینی)دا، رەڵمو خیز پری کردەوە ولەکەڵك کەوتو وێل کرا[٢].

لە مرۆڤێکی کەبیری کۆمەڵایەتی ئەو تائەم رادە بوە، باوەر ناکرێ کە کتێبخانە یەك ئاور تێ بەر بدات.

وە، ئەمما عومەر، هەر چەند پیاوێکی بەزاکون‌و توورە بوە، بەڵام هیچ کەس لەو شیاری‌و تێبینی‌و، پاشە رۆژ لەبەر چاو گرتنی ئەودا، شك‌و گومانی نیە. عومەر بۆ ئەوەی هەموو ئەرکێك تەنیا وەعودەی خۆی نەگرێ‌و جگە لەمەش لەبیرو بروای خەڵکی دیکە یارمەتی وەرگرێ، لە مەبەستە گرینگەکان‌دا، بە تایبەت سەبارەت بە کاروباری دەرەوەی حکومەتەکەی، راوێژگەری پێك دەهێناو راوێژەری وتەگبیرو رای دەکرد، کە لە کتێبە مێژویی یەکان‌دا، نووسراوەو لە نهج‌البلاغەش دا، دوو نموونە لە راوێژ کردنی عومەر، لە جێگای خۆی، ئیشارەی پێ کراوە. لە هیچ مێژوێك دا نەدیتراوە کە عومەر، سەبارەت بە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە شورای پێك هێنابێ و دەگەل کەس راوێژەری کردبێت. زۆر لەوە دوورە بێ‌راو تەگبیر هەڵی کوتابێتە سەر کارێکی ئاوا. جگە لە مەش ئەگەر عومەر بیرو بروای ئەمە بایە، کە لەسەر قورئان‌را، نیازمان بە کتێبیکی دیکە نیە، دەبوو بروای بەمەش بوویایە، کە سەرە رای مزگەوت، پێویستی‌مان بە، مەعبەدو پەرستشگای دیکە نیە؛ ئەی بۆچی لە قەراردادە کانی خۆی‌دا، کلیساکان‌و کەنیسەکان‌و ئاگرگە کان قبوول ئەکا. بەڵکە دەوڵەتی ئیسلامی، پەیماندەری پارێزگاری لەوانە ئەزانێ کە لەبەرانبەری پەنانشینەکانی ئیسلام، ئەرکی سەرشانی بەرێو بەرێت؟.

**حەوتەم** ـ گرتمان عەمری کوری عاس، دەستورێکی ئاوای دابێ؛ ئاخۆ باوەر بەمە ئەکرێ، گەلەکانی مەسیحی‌و جوولەکەی ئەسکەندەرییە، بە بێ‌هیچ بەر بەرە کانیەك، ئەو کتێبانە، کە دەسکەوتی فەرهەنگ‌و مێژوی ئەوان بوو، وەك عەمباری

١) من باش لێی نازانم؛ لە رواڵەتا ئەو شوێنەئاوە، هەر ئەو جێگایە یە کەدیسان لەم سەتانەی دواییدا، کراوەتەوەو ئێستابە (کانالی سوئز) ناوبانگی هەیە.

٢) مێژوی شارستانێتی، وەرگێراوەی فارسی، جزمی ١١، لاپەرەی ٢٢٠.

ویشکەدار، بە خەڵکی دیکە بسپێرن و بیان سووتێنن و حەتتا بەنهێنیش ئـەو کتێبانە ڕانەگوێزن و نەیان شارنەوە؟!!.

# وتەی قفطی

ئەمما نەقڵی قفطی: وێنەی ئەم وتانەیە، کە ابوالفرج ئـەیان گێڕێتەوە. تەواوی ئەم ڕەخنانەی کە بەحەق لە ابوالفرج ئەگیرێ، بۆ ئەویش جێی خۆیەتی. هەر وەك ابوالفرج لە کتێبی مێژوی خۆی، کە بەر بڵاوە و بەزمانی سـریانی نووسـیویە، ئـەم باسەی نەنووسیوە، بەڵام لە **مختصر الدول** دا، کە عەرەبیەو کورتکـراوەی هەمان کتێبە **سریانیە** کەیە، داستانی کتێب سـووتانی هێناوە تەوە. ئـەوە جێگـای سـەر سوورمانە کە قفطی‌ش لە کتێبێك‌دا، کە سـەبارەت بە مێژوی میسـر نووسـیویە،[1] باسـێکی لەو چیرۆکە سـەیرە نە نووســیوە. بەڵام لە کتێبی **(اخبار العلما باخبار الحکماء)** کە مێژوی فەلسەفە زانەکانە لە ژێر ئــەحــواڵی یحیی نحــوی، ئــەم داســتانەی بەبێ ناوبردنی هیچ بەڵگــەیەك باس کردوە. بەم هۆیە، لە نەقڵی قفطی‌ش دا، یحیی نحوی یەکێك لەو دوو قارەمانەی بەدی هێنەری ئەم باسەیەو، بەقسەی خۆیان تەواوی ئەو کتێبانە کەسەبارەت بە حیکمەت‌و فـەلسـەفـە بوون، ئەوەندە زۆر بوون کە چوار هەزار حـەمام یان لە ماوەی شـەش مانگ‌دا، پێ گەرم کراوە.

قفطی ئەڵێ: کە **یحیی نحوی** لە پێشدا، «گەمیەی لێ خوڕیوە» واتە کەشـتی بەرێوە بردوە. لە تەمەنی چل‌و پێنج سـاڵی‌دا، ئـەوین‌و هەوای دەرس خـوێندن، لە سەری داوە و دوایە، بوتە فەیلەسوف‌و هەم پزشك‌و هەم زانای نووسـەر و هەم بە پلەی قەشە گەری شاری ئەسکەندەرییە گەیشتوە.

---

١) جورجی زەیدان، مێژوی شارستانێتی، جزمی ٣، وەرگێراوەی فارسی لاپەرەی ٦٤.

## شك‌و گومانی مێژو، سەبارەت بە یەحیا نەحوی

سەبارەت بە یەحیا نەحوی، چەشنە گومانێك لە مێژو دا هەیە. ئەوەی کە ئاشکرایە، پیاوێکی فیلسوف‌و ئوسقوف، لە دەورەی بەر لە ئیسلام دا بوە و هەر ئەوەیە، کە لە رەد کردنەوەی **ابرقلس و اَرَسطو** دا، بۆ بەرایی‌و پارێزگاری لە بنچینەو بنەرەتەکانی مەسیحییەت، کتێبی نووسیوە و **بوعلی** لە نامەی بەناوبانگی خۆی‌دا بۆ **ابوریحان بیرونی**، بە ناحەزی ناوی بردوە و پێی وایە کە ئەو کابرایە، نەك لە رووی بیروبروا، بەڵکە بۆ هەڵخەڵەتاندنی زۆر بەی خەڵکی مەسیحی، ئەو کتێبانەی نووسیوە.

لە لایەکی دیکەوە، **ابن الندیم**، لە کتێبی **الفهرست** دا، ناوی یەحیای بردوە کە دەگەڵ عومەر و عەمری عاس یەکتریان چاو پێ کەوتوە؛ بەبێ ئەوەی باسێکی لە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە کردبێت. لە کتێبی باوەر پێ کراوی «**صوان الحکمة**» **ابوسلیمان منطقی** ئەنووسێ: ئەو لە زەمانی **عثمان و معاویە** دا، دیتراوە. کە وابوو، یان نەقڵی **ابن الندیم** و **ابوسلیمان منطقی** دروست نیە، یان ئەو کەسەی کە لەزەمانی عەمری عاس‌و معاویەدا بوە، یەحیا ناویکی دیکە بوە، بەبێ ئەوەی پیاوێکی سەرناسی وا بووبێت کە شەرح‌و درێژە وتاری لەسەر کتێبەکانی **اَرَسطو** نووسیبێت‌و قەشەی شاری ئەسکەندەرییە بێت.

دوورنیە ئەو کەسانەی چیروکی کتێبخانەی ئەسکەندەرییەیان دروست کردوە، لەو یەحیا ناوەی کە لەوتاری **ابن الندیم** و **ابوسلیمان منطقی** دا ناوبراوە، کەڵکیان وەرگرتبێ‌و داستانەکەیان پێك هێنابێ، بەبێ ئەوەی بروانن کە رەنگە دووکەس بەو ناوە بووبن. بگرە یەکێك بەوناوە، لە زەمانی عەمری عاس‌و عوسمان‌و معاویە. دا بوە، کە ناکرێ هەر هەمان ئوسقوفی فیلسوفی بەناوبانگی ئەسکەندەرییە بووبێت.

بە هەر حاڵ ئەوە ئاشکرایە، کە یەحیانەحوی ئەسکەندەرانی، فیلسوف‌و پزشك‌و شیکەرەوەی کتێبی ارسطو وقەشەی بەناوبانگی ئەسکەندەرییە، زەمانی عەمری عاس‌و معاویەی نەدیوە.

# وتەی حاج خەلیفە

ئەمما حاج خەلیفە: ئەم پیاوە، لە سەتەکانی دوایین، یانێ سـەتەی یازدەهەمی کۆچـیدا ژیاوە. ناوبراو، کتێبناس‌و پیڕست نووســە، نەك مێژو نووس. کتێبی بەناوبانگی ئەو «کشف‌الظنون»ە، کە فهرست واتە پیڕسـتی کتێبانەو لە هونەری نەوعی خویدا بایەخدارە. جوملەو کورتە وتەیەکی کەلەو ئـەگێرنەوە، دوو بەشـە، بەشی هەوەڵیان ئەمەیە کە:

«عەرەب لە سەرەتای ئیسلامدا، ئەو زانسـتانەی کە سـەرنجـی پیێ ئـەدا، سێبەش بوون: یەکەتی خوا، دەستووورە ئایینی یەکان‌و سێهەم پزشکـی، کە بەر لەمەش شتێکیان لیێدەزانی و جگەلەوە، پیویستی شیان پێی بوو. بەڵام خـۆیان لە دەرەتەی زانسـتەکانی دیکـە، نەدەدا، چـونکە نەیان دەویسـت بەر لەمەی بناغەی ئیسلام قایم بێ، زانستەکانی بێگانە لە ناو خەڵكدا، پەرەبگرێ.

وتەی حاج خـەلیفـە تائێرە، وتەیەکی دروسـتە؛ ئێمە لە کتێبی (خــزمەتەکانی لەبەرانبەر یەکی ئیسلام وئێران)، بەشی خزمەتە کانی ئێران بەئیسلامدا، سەرەتاو چلۆنێتی پێشکەوت‌و سـەر کەوتنی زانسـتەکان‌مان لە ئیسـلامدا شـی کردۆتەوە، زانستەکانی ئیسلامی لە خـوێندنەوە، شــەریعــەت‌و ریێزمان‌را دەســتی پیێکرد. لەهەوەڵەوە سەرنج بەزانستەکانی فەلسەفە یاطبیعی یا ریاضی نەدە درا، وردە وردە، بەو زانستانە سەرنج‌درا.

بەشی دووهەمی وتەی حاج خەلیفە ئـەمەیە: «حـەتتا ئـەڵێن کە عەرەب، کاتی گرتنی شارەکان، هەر کتێبیکی کەوە دەستی کەوتبایە ئەی سووتاند».

ئەبینین کەحاجی خـەلیفـەش ـ هەرچـەند کە مێژو نووس نیە ـ نوکتە یەکی کە

کارزانی نەقڵ‌و وتە، گێرە وە، لە کاری خۆیان‌دا لەبەر چاوی ئـەگرن، چـاوە دێری لێ‌کردوە. نەی وتوە، کە عەرەب کاتی گرتنی شـارەکان، کتێبان ئـەسـووتێنن؛ کەبیێتە بروا دەربرینی خـۆی‌و، دان بەوەی خـەڵك وتوویانە، ئـەڵێ: «وا ئەڵێن.....».

شك لەمە دانیە، کە لەزەمانی حاج خەلیفە کە سەتەی یازدەهەم بوە، قسەیەکی ئاوا کراوە. چوار سەتە بوە، کە ئەم قسە ئەوترا و خودبەخودو سەتە بە سەتە، زیاتر ئەکەوتە سـەر زمانان. وەك ئـەمە وایە، کە ئێمە ئێسـتا بڵێین: وا ئـەڵێن..... و زۆریش ئەوترێ کە موسوڵمانانی سەرەتای ئیسلام، لە هەر جێگـەیەك کتێبێکیان دەس کەوتبایە، ئەیان سووتاند. ئـەگەر ئێمرۆ ئێمە قسـەیەکی وا بکـەین درۆمان نەکردوە؛ چونکە بیسـتمان‌و دیتمان لە زەمانی عبداللطیف و ابوالفَـرَج‌و قفـطی را، قسەیەکی وا دەس پێ‌کراو، دوایەش درێژەی پێ‌درا.

کەوابوو حاج خـەلیفـە جگـە لەمەی وەك عبداللطیف‌و ئـەوانی‌تر، مەدرەك‌و بەڵگەیەکی ناو نەبردوە، شتێکی تازەی نەوتوە، ئەوەی لە زەمانی ئـەودا، کەوتۆتە سەرزمانان، بەوشەی فعل مجهول عەرەبی (ویروی) واتە: وا ئەڵێن و بە نیشانەی باوەر پێ نەکردن هێناویەتە سەرکاغەز.

## مقریزی

دوای عبداللطیف، تاقمێکـی‌تر عەینی وتەی ئـەویان لە کتێبەکانی خـۆیان‌دا هێناوەتە سەرکاغەز وچون ئاشکرایە سـەرچـاوەی نەقڵەکە ئـەچێتەوە سـەر عبداللطیف، شیاوی باس لێ‌کردن‌و لێکۆڵینەوە نیە.

بۆ نموونە مقریزی، کتێبێکی سەبارەت بە مێژوی میسر نووسیوە، کە بە «خطط مقریزی» ناوبانگی رۆیشـتوە. ناوبراو لەو جێگـەیە، کەوەك مێژو نووسـێك باسـی گیرانی ئەسکەندەرییەی نووسـیوە، ناوێکـی لە کتێب سـووتان نەبردوە، بەڵام لەو جێگایە کە ئـەگاتە تاریفـی «عَمودالسّـاوی» کە عبداللطیف هەر وەك ئـەو، وتەی بەناوبانگی خـۆی لە ژێر تاریفـی ئـەو جیگـایە دا کوتوە، عەینی وتەی عبداللطیف وشە بە وشە، دووپاتە ئەکاتەوە؛ ئەمە بۆ خۆی نیشان ئەدا، کە مقریزی پچوکترین بروایەکی بەم نەقڵە نەبوە، دەنا بەلانی کەمەوە، دەگەڵ باسـی گیرانی ئەسکەندەرییە، ئـەی نووسـی، یان وشـەی «ویذکَر»یانی (وا ئـەڵێن)ی، لە

وتارەکەی دەر دەخستو نەی دە نووسی.

## ابن خلدون و کتێب سووتانی ئێران

ئێستا نۆ بەی ئەمەیە کە لێکۆڵینەوەی وتەی ابن خلدون، کە سەبارەت بەکتێب سووتان لە ئێران باسی کردوە وچوارەمین بەڵگەیە، کە خوا لێ خۆشبوو دوکتور موعین بە نەقڵ لە پورداود، هێناویەتەوە، دەس پێ بکەین.

ئەگەر نەروانینە ئەسڵی وتاری ابن خلدون، و بە نەقڵی پورداود لە «یشتها»دا، کە خوا لێ خۆشبوو دوکتور موعین باسەکەی لەوێ دەر کێشاوە، باوەر بکەین، ئەبێ بڵێین ابن خلدون کە خۆی مێژو نووسەو دەگەڵ عبداللطیف کە هەرپزشکەو ویستوویە سەفەرنامە بنووسێ، یا ابوالفَرَج کە ئەویش پزشکە یا حاج خەلیفە، کە فهرست نووسە واتە پێرستی کتێبانی نووسیوە، و حەتتا دەگەڵ قفطی کە تاریخ الحکمای نووسیوە، ناکرێ هەڵیانسەنگێنین. ابن خلدون، هەرچەند لە ئاخرو ئوخری سەتەی هەشتەمو سەرەتاکانی سەتەی نۆهەمی کۆچیدا ژیاوە، و لە مێژو نووسانی سەتەی دووهەمو سێهەمو چوارەم نیە، کە بۆخۆی بتوانێ راستەو راست لە ریگەی مەبەست وەرگرتن لە خەڵك بەبێ ئەوەی بتوانێ بەڵگەی مەبەست بەرێتەوە سەرکتێبو کانگای رەسەن، شتی ئاوا قەدیمی بنووسێ بەڵام بەهۆی ئەمە، کە ناوبراو مێژو نووسێکی مێژوی گشتیەو جێگای بروایە، ئەگەر مەبەستێك بە چەشنێك بنووسێ کە برواو باوەری پتەوی ئەو راستەقینەی باسەکە نیشان بدات، ئەبێ بڵێین کە بەڵگەیەکی دەس کەوتوە، کە لانی کەم، بۆ ئەو جێگای باوەر پێکردن بوە؛ کەوایە وتەی ئەو هەرچەند قەولێکی تەواو روون کراوە نایەتە ژمارە، بەڵام ئەکرێ بە وتەیەکی «مُرسَل» و ناردراوە بناسرێ.

بەڵام ابن خلدون بروای خۆی دەر نەبریوە و بە شێوەی «فعل مجهول»، واتە کارێکی کە بەجێ هاتنی روون نیە، قسەی لێ کردوە؛ ئەویش وتاری خۆی بە «وَلَقَد یقال» واتە (بزانە ئاوا ئەڵێن) دەس پێ کردوە. یانێ وتەیەکی بێ‌پێز نەحەتتا کەم هێز (مُرسَل).

جگە لەمە، ابن خلدون لە سەرەتای قسەکەی چەند وشەی زیاد کردوە، کە پتر بۆتە هۆی کەساسیو باوەر پێ نەکراوەیی باسەکە.

ناوبراو، دوای ئەوە بەپێی رواڵەتی کۆمەڵایەتی تایبەتی خۆی ـ کە جێگای

قبوولّی خەڵکی دیکەنیە ـ وئەویش ئەمەیە: «لەهەر جێگـایەك کە مڵك وئـاوەدانی پەرەی سەند بێ، بمانەوێ یا نەمانەوێ زانسـتەکانی عەقڵی پەرە ئـەسـتێنن.» لەو وتانە، نەتیجە ئەگرێ: «لە ئێران کە مڵك وئاوەدانی پەرەی سـاند بوو، نە گونجـا وە، زانستەکانی عەقڵی پەرە نەستێنن.» ئەڵێ: وە بەو جۆرە ئەڵێن، کەئەم زانستانە لە لایەن ئێرانیانەوە بەیونان گەیشتوە، ئـەوکاتە کە ئـەسکـەندەر دارای کوشـتو بەسـەر وڵاتی «کەیانی» دا، دەسـەڵاتی پەیدا کردو کتێبەکانو زانسـتەکانی زۆرو بێژماری کەوتە دەسـت، هەر وەها، وەختێ وڵاتی ئێران بەهۆی عەرەبان گیرا، کتێبیکی زۆریان چاو پێکەوت **سَعدِ وَقّاص** نامەی بۆعومەر نووسی.....».

وەکوو ئێمە ئەزانین، ئەوەی کە ئەسکـەندەر کتێبانی لە ئێرانەوە بردبێتە یونانو دوای گیرانی ئێران بە دەستی ئەسکەندەر، یونانیان زانستەکانی تازەیان وە دەست کەوتبێت. مەبەستێکە کە هیچ مێژوێك ئـەوەی نەوتوە و هیچ بناغەو بنچینە یەکی نیە.

ئـاغای پورداود، لێرەدا دەغەڵیان فـەرموە؛ چـونکە بەشـی هەوەڵ کە بریتیە لە روون نەبوونی باسەکە «**ولقـد یقــال**» و هەر وەها، داسـتانی دروسـتکراوی گوێزتنەوەی کتێبانو زانستەکان لە ئێرانەوە بۆیونانی لابردوەو دەسـتی کردوە بە نەتیجەگیریو ئاکام وەرگرتن لە قسەکانی خۆی.

## سەر چاوەی، باسە دروستکراوەکەی کتێب سووتانی ئێران

سەر چاوەی بەیتو باوێکی کە ابن‌خلدون ئیشارەی پیٚ کردوون، دەگەڵ بەدیهێنەرانی دەلەسەی کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە، لە رواڵەت دا دوانن. باسە بڵاو کراوەکەی کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە، مەسیحیەکان دروستیان کردوە، بۆئەوەی ئەم کارە خراپە، لە ملی خۆیان کە بەدیهێنەری ئەسڵی ئەون، دابرنن‌و بیخەنە سەرئەستۆی موسوڵمانان. بەڵام سەرچاوەی باس‌و خواسێکی کە ابن خلدون ئیشارەی پیٚ کردوون، لە رواڵەتا «شعوبیە[1]» کانن، ئەویش شعوبیانی ئەم

---

١) شعوبیە یا شعوبیان، کۆمەڵێك بوون کە زیاتریان ئێرانی بوون و دژی رەگەزپەرستی‌و خۆبەزل‌زانینی عەرەبەکانی دەورەی (بنی‌امیّە)، کە بە گەلەکانی غەیری عەرەبیان دەگوت (مَوالی) و کاروباری گرینگی وڵاتەکانی ئیسلامیان، بۆ خۆیان داگیرکردبوو و گەلەکانی تریان بەچاوی سووك تەماشادەکرد.

شعوبیەکان لە هەوەڵەوە، دژی رەگەزپەرستی خەباتیان دەس پیٚ‌کردو بە لەبەرچاوگرتنی (اِنَّ **اکرمکم عندالله اتقیکم**) ئایەی ١٣ سورەی **(حجرات)**، لە قورئانی پیرۆز، کە دە فەرمویٚ (چاکترینی ئیوە کەسێکە کە پاکترینی ئێوە بێت)، هەوڵیان ئەدا، چاکی‌وپاکی بکەنە هۆی سەرکەوتن‌و پێشکەوتن.

ئەو جووڵانەوە، لە زەمانی خەلیفەکانی عەبباسی‌را، دەستی پیٚ‌کراو تا رادەیەك بافیش‌و خۆبەزل‌زانینی عەرەبەکانی کەم کردەوە. بەڵام لە دواییدا، شعوبیان بۆخۆیان رەگەز پەرستی‌و هەستی خۆ لە هەموو کەس چاکتریان، دەس پیٚ‌کرد. بەخۆدا هەڵکوتن‌و شانازی بەرابردوو، پاکتر نیشان‌دانی رەگەزی عەجەم بەسەر عەرەبدا، و عەیب‌وعار نیشان دان‌و سەروگویٚ کوتانی ئەوانیان، بە وتارو وشەی ناحەزو سووك، پەرەپیٚدا. نووسەران‌و شاعیران، **مثالب العرب**، یان واتە: عەیب‌و شورەییەکانی عەرەبانیان نووسی‌و بڵاوکردەوە و ناوی چەندکەس لە شاعیران‌و نووسەرانی شعوبی

←

دواییە. ابن خلدون خویشی خاڵی لە هەستی شعوبایەتی و دوژمنایەتی سەبارەت بەعەرەب نیە. شعوبیانی ئیرانی، دروشمیان ئەمە بوو: «هنر نزد ایرانیان است و بس». واتە: «زانینو هونەر، هەر لای ئێرانیانەو تەواو».

لە رواڵەتی وتەی **ابن خلدون**، ئەکرێ ئەمە تێبگەین، کە ویستویە بڵێ «تەواوی زانستەکانی یونان هی ئێرانە»؛ لە حاڵێکا ئەزانین کە ئەسکەندەر لە زەمانی **ارَسطودا** هێرشی بۆئێران هێناوە و شارستانێتی یونان لەو کاتەدا، لەپلەی بەرزی پشکوتنو گەشانەوە دا بوە.

مەبەستی دیکە ئەمەیە، کە ئەوەی تائێستا لە **ابن خلدون** گێراویانەتەوە، لە سەرەتای نووسراوەی ئەوە، کە کتێبێکە فەلسەفیو کۆمەڵایەتی. هێشتا نەمان دیوە، کە ئەم مەبەستە، کەسێك لە مێژوە نوسراوەی کەی ئەو بەناوی **«العبرو دیوان المبتدأ والخبر»** گێرابیەتەوە. **ابن خلدون** ئەگەر بۆ ئەم چیرۆکە بایەخی مێژویی لەبەر چاو بگرتایە، دەبوو لەودا، بێ گێرابایەوە.

بەداخەوە مێژوی **ابن خلدون** لە ئیختیارم دانیە، بەڵام ئەگەر شتێکی (سەبارەت بەم مەبەستە)ی تێدا بوویایە، زۆر دوور بوو کە لە دەس زیرەكو رەندان دەر بچووبایە؛ ئەگەر مەبەستێکیوا، لە مێژوکەی **ابن خلدون** دا بوویایە، لەویان باس دەگێراوە، نەك لە سەرەتاکەی. دەبێ بروانرێتە عەینی مێژوی **ابن خلدون** دا.

---

→

ئەمانەن متوکل لە هاودەمانی متوکل خەلیفەی عەباسی، بشّار بن‌برد طخارستانی، ابوعثمان سعیدبن حمید،؛ لە نەجیبزادەکانی: ئێرانی نووسەری کتێبی **انتصاف العجم من عرب و فضل‌العجم علی العرب و افتخارها** میثم بن العدی هاوزەمانی منصورو مەهدیو هادیو هارون، خاوەنی کتێبی «المثالب الصغیر، کتێبی المثالب الکبیر، کتیبی مثالب ربیعه، اخبار الفرس».

وەهی دیکەیان وەك: سهل بن هارونی دەشت میشانی هاوزەمانی مأمونو سەرۆکی بیت‌الحکمه، کە چەندکتیبی لە بارەی کارە ناحەزەکانی عەرەبدا، نووسیوە. علاّن شعوبی، خاوەنی **المیدن فی المثالب**، معمّربن المثنی دانەری کتێبی لصوص العرب و فضائل الفرس، لێ هەڵکەوتوەو لە سەتەی دووەم تا سەتەی چوارەمی کۆچی بە توندی خەریکی شانازی کردن بە رابردوی خۆیانو سووكو چروك نیشان دانی عەرەب بوون.

کورتەیەك لە فەرهەنگی موعین، جزمی ٥، ئەعلام، لاپەرەی ٩٠٤ چاپی سێهەم، ١٣٥٦ هەتاوی.

وە کەمێك لە دایرە المعارفی فارسی (دوکتور غولامحسین سەفا) جزمی دووەم، بەشی یەکەم، لاپەرەی ١٤٧٨.

«وەرگێر»

# نیشانە ڕواڵەتیەکان بۆ درۆ بوونی مەبەستەکە

لەبارەی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، سەرەڕای نەبوونی سەرچاوە وجگـە لەوەی باسگێرە وەکان بە چەشنی کاری نادیاری (فِعل مجهول)، کە نیشانەی بێباوەری خۆیانە سـەبارەت بەمەبەسـتە کە، باســەکەیان گێراوەتەوە. لیزگە نیشــانەیەکی ڕواڵەتیش بۆ درۆ بوونی کارە ساتەکە هەبوو، یەکێك لەوان ئەمەیە مێژو ئەڵێ:

«ئەم کتێبخانە، لە سەتەکانی پێش ئیسلامەرا، لەناو چوە».

سەبارەت بەکتێب سـووتانی ئێرانیش هێندێك بەڵگـەی ڕواڵەتی هەیە، یەکیان ئـەمەیە کە، هەر لە بنەرەتا مێژو، بوونی کتێبخـانەیەکی لە ئێران‌دا باس نەکردوە. بەپێچەوانەی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە کە بوونی کتێبخانەیەکی بەم چـەشنە، لە ساڵەکانی نێوان سێ سەتە، بەر لە دایك بوونی حەزرەتی عیسا، تا نزیکـەی چـوار سەتە دوای زایینی، مێژو لەسـەری سـوورە وبوە. ئـەگەر لە ئێرانیش کتێبخــانە بونایە کە ئەگەر سووتاند نیشیان باسی لێ نەکرابا، بەلانی کەم بوونی کتێبخانەکە باسی لێ دەکرا. ئەزانین بەتایبەت بەهۆی ئەمە، بەسـەر هاتە کانی ئێران‌و مێژوی ئێران، زیاتر لە هەر جێگـایەکی دیکـە لە مێژوی ئیســلامی دا، بەهۆی خــودی ئێرانیان نووسراوەو ڕاگیراوە.

دیسان بەهۆی ئەمە، لە ئێران‌دا کارەساتی ئاوا تایبەتی ڕوویان داوەو حاڵەتێکی وەهایان بەدی هێناوە، کە ئەگەر کتێب سـووتان لە ئێران‌دا ڕووی بدایە، هیچ لێی ڕانەدە وەستان‌و دەس بەجێ ئـەیان نووسـی‌و ڕایان ئـەگرت‌و زۆریش بەئێشـتیا و تین‌و تایبەت، ئەو کارەیان ئەکرد و هۆو هەلێکی بۆ ئـەو کارە هەڵکـەوتبوو، پەیدا بوونی شـعوبیە بوو. شـعوبیگەری هەرچـەند لە هەوەڵەوە، شـۆڕشێکی پاکی

ئیسـلامی، داخـوازی داد پەر وەری‌و دژی جیاوازی دانان‌و زۆرەملەی رەگەزێك بەسـەر رەگەزێکـی دیکـەدا بوو؛ بەڵام لە دوایی‌دا گۆرا، بەجـووڵانە وەیەکی رەگەز پەرسـتانەی دژی عەرەب. ئێرانیانی شـعوبی مەبەسـت، زۆر کتێبیان سـەبارەت بە (مثالب العَـرَب) واتە: ناحـەزنیشـان دانی کردەوەی عەرەبەکان نووسـی‌و لەهەر جێگـەیەك تۆسکـاڵە رەخنەیەکیان لە عەرەب دەدیتەوە، زۆر بە تین‌و تانەو تیزو لۆمەوە، نووسیان‌و بڵاویان کردەوە. ئـەگەر لە کەڵین‌و قـوژبنی مێژو دا، تۆسکـاڵە شتێ کیان بدوزیایەوە، لە سیرتا پیواز، لێی رانە دەوەستان.

ئەگەر عەرەب عەیبێکی ئاوا گەورەی بوبایەو کتێبخانەی ئاگر بدابایە، بە تایبەت کتێبخانەی ئێران، حەستەم بوەو نەئـەگونجـا شـعوبیان، کە لەسـەتەی دووەمی کۆچـی‌را، کاریان بەرەو سـەر رویشـتبوو وعەبباسـیەکان بە گوێرەی دوژمنایەتی دەگەڵ بەنی ئومەییەو هەسـتی دژی عەرەب کەبوویان بە شـعوبیەکان پەروباڵیان ئەدا، سەبارەت بە کتێب سووتانی عەرەبەکان بێدەنگ‌و کرومات دا بنیشن، بەڵکـە زۆریشان لەسەر زیاد دەکردو هەراو قریوەیان وەرێ دەخست؛ لە حـالێکا شـعوبیان ئەو کارەیان نەکردو ئەمە بۆخۆی بەڵگە یەکی پتەوە بۆ ئەوەی دەرکەوێ، چیروکی کتێب سووتانی ئێران خەیاڵیە.

# کورتەی وتار

وتاری ئێمە سەبارەت بەکتێب سووتانی ئێران و ئەسکەندەرییە، دوایی هات.
کورتەی وتار بوو بە ئەمەکە: تا سەتەی حەوتەمی کۆچی، یانێ تانزیکەی شەش سەت ساڵ دوای گیرانی ئێران و میسر، لە هیچ بەڵگەیەك، چ ئیسلامی و چ غیرئیسلامی، باسێك لە کتێب سووتان ـ بەهۆی موسوڵمانان ـ نیە.
بۆ یەکەم جار لە سەتەی حەوتەمدا، ئەم مەبەستە دێتەدی. کەسانێکی بە دیهێنەرن.
**یەکەم** ـ هیچ بەڵگەو سەرچاوەیەکیان نیشان نەداوە و بەراستی باسگێرانەوە کەیان بایەخو باوەر پێکراوەیی مێژوویی نیەو ئەگەر جگە لەو کەمایەسیە، هیچ ناتەواوی دیکەشی نەبایە، بۆ بێ بایەخی وتەکەیان هەر ئەمە بەس بوو.
**دووەم** ـ تەواوی ئەوانە جگە لە ابوالفرج و قفطی، بەیتو باوو باسێکی سەرزمانی خەڵکیان گێراوەتەوە نەك بەسەر هاتێکی راستەقینەیان نووسی بێت. لەرواڵەتی قسە گێرانەوە ویاسای باس وەرگرتنی مێژوویی‌دا، هەر وەختێك باسگێروە، لەجیاتی ئەوەی عەینی بەسەر هاتەکە بگێرێتەوە، «وتەی سەر زمانان» بنووسێتەوە، یانی لە جیاتی ئەوە بڵێ: شتێکی ئاوا رووی‌دا، بنووسێ: «ئەڵێن شتێکی‌وا، رووی داوە»؛ نیشانەی ئەمەیە، کە حەتتا وێژەریا نووسەر، بۆخۆی بروای بەرووداني ئەو بەسەرهاتە نیە.
**سێهەم** ـ باسە گێردراوە کانی سەتەی حەوتەم، کەریشەو کانگای باسەکانن، یانی باسگێرەوەیی **عبداللطیف و ابوالفـرَج**، لە ناوە رۆكدا بریتین لە دەلەسەو درۆی ئاشکرا، کە ئەمەش بەڵگەی بێ بایەخی ئەوانە.

جگە لە تەواوی ئـەمانە، چ لەبارەی ئێران‌و چ سـەبارەت بە ئـەسکـــەندەرییە، نیشانەی رواڵەتی (قـــرائن خـــارجی) هەیە، کە ئـــەگەر نەبوونی‌و کە مایەســـی بەڵگەیی‌و ناوە رۆکیشیان نەبایە، ئەو رواڵەتی راستەقینانە، وتەی ئەوانی لە بایەخ‌و باوەر پێکراوەیی ئەخست.

# تكای لیٚ بوردن له خزمەت خوێنەران، سەبارەت به درێژەدانی وتار

رەنگە بۆ خـوێنەری بەریز، ئـەم بروایە بێتەدی، کە سـەبارەت بەم مەبەسـتە، بەدرێژە قسەم کرد بیٚو له کاری لێکوٚڵینەوە دا، زوٚری لەسەر روٚیشـتبمو هەر ئـەم کورتە باسەم توٚزێك درێژ بکردایەوە، ئیتر بەس بوو.

دان بەمە ئـەدەم کە ئـەگەر چیروکی کتێب سـووتان، تەنیا بەناوی تاقـەروو داوەیەکی مێژویی لە ریبازی لێکـوٚڵینەوە دا، بکـریٚ لێك بدرێتەوە، ئیتر نیازی بەم هەموو لەسەر روٚیشتنە نیە. بەڵام خوێنەری بەرێز ئەبیٚ بزانێ، کە ئەم داستانەیان له جاغزی لێکوٚڵینەوە و لە باری لێکدانە وەی زانستی دەرخستوەو «سـوژە»یەکیان بوٚ تەبلیغاتو هەڵخەڵە تاندنی خەڵك لیٚ دروست کردوە. بوٚ لێکوٚڵە رانی بیٚ لایەن، چ موسوڵمانو چ غەیری موسـوڵمان، بیٚپایەو بیٚمایە بوونی ئـەم ئـەفسـانەیە، سوورو روونو ئاشکرایە، بەڵام کوٚمەڵانێکی کە بە چـەشـنێك قـازانجی خـوٚیان لە بەگویٚ گەیاندنی ئەم چیروٚکە ئـەبینن، دەسـت هەڵناگرن؛ تەقـەلا ئـەکەن لە رێگەکانی جوٚر بەجوٚر، ئەم داستانە بکەنە هوٚی راگەیاندن. بەگویٚ گەیاندنی کتێب سووتاندن لە ئێرانو لە ئەسکەندەرییە، وردە وردە، بە چەشنی یەك «دەسـتوور» و «یەك شێوەی پەلامار» دەرهاتوە.

**شبلی نعمان** لە کتێبیلکەی «کتێبخانەی ئەسکەندەرییە» دا ئەڵیٚ:

لێکوٚڵەرانی بەناوبانگـی ئـوروپایی وەکوو: **گیبون، کارلیل، گدفـری، هکتور، رنان، سیدلو** و هی دیکە، زوٚر بەی ئەو باسـە هیچو پووچـانەیان ـ کە سـەبارەت بەئیسـلامو موسـوڵمانان بڵاو کراونەوە ـ بەناراسـتـو بیٚ بناغە زانیوەو روونو ئاشکرا، ئەمانەیان داونەتە دواوەو، وەدروٚیان خستوونەوە. بەڵام لە نووسراوەکانو

وتەی سەر زمانی زۆر بەی خـەڵك دا، هیشـتا هەر ماون‌و ئـەبێ بزانین لەناو ئـەو باسە بڵاو کراوانە کەوتمان، یەکیان باسی سووتاندنی کتێبخانەی ئەسکـەندەرییە، یە. ئوروپا ئەم کارە ساتە (خەیاڵیەی) بەدەنگێکی سەیرو ئاهەنگێکـی سـامهێنەر، بڵاو کردوّتەوە کە بەراستی سەر سـوور هێنەرە. کتێبەکانی مێژو، چیرۆك، ئـایین، مەنتیق، فەلسەفە، وهی وەك ئەوانە، هیچ کام لە نیشانەی ئەو مەبەستە، بەتاڵ نین (بۆ ئەمەی ئەم چیروّکە لە بیری خەڵك‌دا، ئاوێتە بکرێ لەهەر چـەشـنە کتێبێك‌دا، بەبیانووی کەوە، ئەم باسەیان تی پەستاوتوە، تا دەگاتە کتێبی فەلسەفەو مەنتیق).

حەتتا ساڵێك لە ئازمون‌و تاقیکردنەوەی ساڵانەی «اونیورسیتە»ی کەلکـەتەی هیند (کە لە ژێر چـاوەدێری ئینگلیسـیەکان دا، بوو) لە کاغەزی پرسـیاری‌دا، بۆ «منطق» کە چەند هەزار نوسخەی لێ چـاپ‌کرا بوو، هەڵدان‌و زانینی مەتەڵۆکەی خوارەوەیان پرسیار کردبوو.

ئەگەر کتێبەکان دەگەڵ قـورئان یەك دەگرنەوە پێویسـتیەك بەوان نیەو ئـەگەر یەك ناگرنەوە هەموویان بسووتێنە[1].

شـبلی نەعمان لە دوایی دا، ئـەو پرسـیارە دێنێتە پێش کە، چ سـیاسەتێك لە کارایە؟ ئایا ئەمە، هاودەردی‌و دڵسوزیە، سەبارەت بەو کتێبانەی ئەڵێن سووتاون، یا هەست‌و ویستێکی دیکە لە کاردایە؟.

ئەگەر دڵ پێ سووتانە بۆچـی سـەبارەت بەو کتێب سـووتانەی ئـاشکراترو زۆر گرینگتر، کە لەگیرانی «اندلس» (ئـەسپانیا) و شـەرەکانی سـەلیبی‌دا، بەهۆی خودی مەسیحیەکان بەدی‌هات هیچ کاتێك دڵسۆزی ناکرێ؟!.

شبلی بۆ خۆی بەم چەشنە لە وەڵام دا ئەڵێ کە: هۆی ئەسـڵی ئـەمەیە کە ئـەم کتێبخانە، مەسـیحیەکان بۆ خـۆیان بەر لە ئیسـلام لە ناویان بردو ئێسـتا بەراگەیاندن‌و بەگوێ گەیاندنی زۆرە وە، وا نیشـان ئـەدەن کە ئـەم کتێبخـانە، موسوڵمانان لەناویان بردوە، نەك بۆ خۆیان. مەبەستی راستەقینە، داپۆشانی رووی گوناحی خۆیانە.

عیللەت‌و هۆیەکی کە شبلی ناوی ئـەبا، یەکێکـە لەو عیللەتانەی مەبەسـتەکە، کەتەنیا لەبارەی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە وە راست ئەگەرێ، چەند هۆیەکی دیکە

---

١) شبلی نەعمان، کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، لاپەرەی ٦.

له كاردايه. مەسئەلەی ئەسڵی ئیستعمارە. ئیستعماری سیاسیو ئابووری، ئەو کاتە سەر ئەکەوێ کە لە ئیستعماری فەرهەنگیدا، سەرکەوێت. بێ بڕواکردنی خەڵك سەبارەت بە فەرهەنگی خۆیان، شەرتی ئەسڵی ئەم سەرکەوتنەیە.

داگیر کەر بەوردی لێی حاڵی بوە وتاقی کردۆتەوە کە، فەرهەنگێکی گەلی موسوڵمان پاڵیان پێوە داوەو بیرو بڕوایەکی پێی ئەنازن، فەرهەنگو ئیدئۆلۆژی ئیسلامییە و ئەوی دی هەمووی قسەنو لە چوار دیواری ڕۆنیشتنو قسەکردن (کۆنفرانسەکانو جێژن گرتنەکانو کۆنگەرە کانو سێمینارەکان) تێ ناپەرێ و ناچێتە ناو کۆمەڵ. بەس کە وایە ئەبێ خەڵك لەو بیرەو لەو ئیمانەو لەو باوەرە و لەو دڵپاکیەو جوانبینیە، بەتاڵو حەتاڵ بکەن تائامادە بکرێن بۆ ئەوەی وێنەی غەربیەکان بن.

بۆ بەد گومانکردنی خەڵك بە فەرهەنگو بیرو بڕواو پەیام هێنەرانی ئەوانە، کامشت لەمە چاکترە، کە بەنەسلو بەرەی نوێ وانیشان بدەن کە، ئەو کەسانەی ئێوە خەیاڵ ئەکەن نەجاتو ڕزگاری خەڵكو پێشەوایی نەوعی بەشەریان بۆ بەختەوەری پێ ئەسپێردراوە و بەم ناوە هەڵمەتیان بردە سەر وڵاتە کانی دیکەو حکومەتانیان ڕووخاند، بۆخۆیان پەلە وەرانە ترین کاریان کردوەو ئەمەش وێنە ونموونەی.

بەم هۆیەوە خوێنەری بەڕێز، سەر سوور نامێنێ کە بەبڕوای کۆری تاقی کردنەوەی ساڵیانەی **ئونیورسیتەی** هیند، کە بەهۆی ئینگلیسیەکان بەڕێوە دەبرا، بۆ هەڵدانی مەتەڵۆکەی منطق پرسیارێك نەدەبیندرا، جگە لە وتارە دروستکراوەکەی (فەرمانی کتێب سووتاندن) و بۆ نووسەرێکی ئێرانیش کە سەرەتای فەلسەفەی بۆ پلەی شەشەمی ناوەندی نووسیوە و هەر ساڵەی دەیان هەزار نوسخە لەو چاپ ئەکرێو ئەدرێتە دەس قوتابیانی بێخەبەری سادە دڵو سافیلکەی ئێرانی، لەو جێگایەدا، کە لەبارەی **«قیاس استثنائی»** (واتە لێك دانەوەو بردنەوە سەریەکی دوو مەبەستی هەڵکەوتوو) لە منطقدا، باس ئەکرێ، نوو سەر سەرەرای بیرکردنەوەو زۆرهێنان بۆمێشکی هیچ پرسیارێکی دیکەی بە بیردانە هاتوە جگە لە هەمان پرسیارەکەی پرسیار کەرانی ئینگلیسی، لە **ئونیورسیتەی** کەلکەتە کردویانەو ناچار بوە مەبەستەکە بەم چەشنە دا بمەزرێنی: ئەگونجێ بردنەوە سەریەکی هەڵکەو توو **(قیاس استثنائی)** لە یەك کاتا، لێك جیاو بە

یەکەوە نووساو، یانیٔ تێکەڵ بێت: وێنەی ئەم چەشنە قیاسە وتەی بەناوبانگی پێشەوای عەرەبە کە وەختیٔ ویستی عیللەتو هۆ بۆ سووتاندنی کتێبخانەی ساسانیان بدوزێتەوە و بە کارێکی شیاو نیشان بدات، بەم جۆرەی دەلیل هێناوە:

ئەم کتێبانە، یا دەگەڵ قورئان یەکێکن یا دژی ئەون، ئەگەر یەکن بوونیان شتێکی زیادییە، ئەگەر دژی ئەون هەر بەو چەشنە کەزیادین زیانباریشن وهەر شتێکی زیادیو زیانبار بێت ئەبیٔ لە ناوچێت. کەوایە لەهەر حاڵا، ئەم کتێبانە ئەبیٔ ئاگر درێن[1].

چەند ساڵ لەمەو بەر، لە موئەسسەی ئیسلامی حوسینیەی ئیرشاد، دوو وتارم بڵاو کردەوە؛ کەناوەکەی **«کتێب سووتانی ئەسکەندەرییە»** بوو و بیٔبناغە بوونو درۆ بوونی ئەم باسەم روون کردەوە. لە بیرمە کە دوای تەواو بوونی ئەو وتارانە، لە لایەن موسوڵمانێکی پاکیلکە نامەیەکم پیٔ گەیشت بەم ناوه رۆك ومانایە: کە تۆ بۆ دەتەویٔ درۆ بوونی ئەم روو داوە، بەخەڵك گویٔ بیست بکەی!؟ لێی گەریٔ، ئەگەر درۆشە، با خەڵك بیڵێن چونکە درۆیەکە بۆ مەسڵەحەتو بەگویٔ گەیاندنێکە دژی عومەری کوری خەتتابو عەمری کوری عاس.

ئەم موسوڵمانە پاکیلکە خەیاڵی کردبوو، کە ئەم هەموو شەیپوور و کەرەنایە، کە لە ئوروپا را هەتا هیندی پر کردوە؛ ئەم هەموو کتێبە لەبارەیدا ئەنووسنو چیرۆکی بۆ دروست ئەکەنو بۆ ئەمەی راستو حەتمی بێتە بەرچاو، لە کتێبەکانی فەلسەفەو مەنتیقو پرسیاری ئیمتحانیدا، ئەی نووسن، بۆخاتری هەستی دوژمنایەتی سەبارەت بە عومەر یا دژی عەمری کوری عاسە، یان بۆ نزیك بوونەوەی خۆیان بۆ لای خوا و بۆ خزمەت کردن بە جیهانی شیعەو ئابروو بردنی غەیری ئەوانە. ئەم جۆرە کەسانە، نازانن کە مەبەست لە هێنانە پێشی ئەم چەشنە باسە، مەسئەلەی ئیسلامە نەك شتێکیتر؛ نازانن کە لە دنیای ئەمرۆدا، چەکی کار لیٔهاتوو دژی یەك دینو یەك ئایین باسە کانی کەلامیو دەلیل هێنانەوەی مەنتقی زەینیو بیراوەری نیە، لە دنیای ئەمرۆدا، شێوەی توش هاتنی بروا پێکەرانی ئایینێك لە مێژو دا، دەگەڵ ئاکارو دیمەنی فەرهەنگو شارستانێتی دیکە، کار لیٔ هاتووترین چەکە، بە قازانج یادژی ئەو ئایینەو ئەودینە.

**تەواو**

---

[1]) دوکتور عەلی ئەکبەر سیاسی **(مبانی فلسفه)** لاپەرەی ٢٥٤.

# گوڵچینێك له كتێبی ژیاننامەی حەزرەتی عومەر، سەبارەت بە كتیب سووتان

سەبارەت بە روون كردنەوەی ئەم مەبەستە، كە كتێبخانەی ئەسكەندەرییە بەهۆی خودی مەسیحیەكان - بە درێژایی مێژو - لەچەند كەڕەت دا ئاگر دراوەو لەناو چوە، ئاغای «باقر قائم‌مقامی» له كتێبی: *ژیانی ئایینی و سیاسی عومەری كوڕی خەتتاب*، لەژێر لاپەرەكانی ٩٦ تا ١٠١ بەشی پازدەهەم، تارێكی بەڵگەدارو ڕوونكەرەوەی هەیە.

هەر وەك له سەرە تاكەی ئەم كتێبەدا نووسراوە: «الكساندر مازاس» نووسەری بەناوبانگی فەرانسەوی، كتێبێكی بەناوی *ناو دارانی رۆژهەڵات* هەیە، كە جزمی یەكەمی ئەوكتێبە، سەبارەتە بە چلۆنایەتی ژیانی حەزرەتی پیغمبەر(ص) و حەزرەتی عومەر و مەئمون‌و سەلاحەددینی ئەییوبی.

ئاغای قایم مقامی، ژیاننامەی حەزرەتی عومەری بە فارسی وەرگێراوەتەوە و له رێبەندانی ساڵی ١٣١٩ ی كۆچی هەتاوی‌دا له شركەتی چاپی كتێب، چاپخانەی بەهار، بڵاوی كردۆتەوە.

ئاغای قائم‌مقامی ئەنووسێ: «لەو كاتەوە كە «بطالسە» بەسەر ئەسكەندەرییەدا زاڵ بوون، شاری ئەسكەندەرییە، بوو بە كانگەی زانست‌و كتیبخانەیەكی گەورە - كە ژومارەی كتێبەكانی بە حەوتسەت هەزار دەگەیشت - لەوی‌دا پێك هات. لەساڵی ٤٧ ی بەر له زایین كە لەسەر - پاشایەتی میسر له نێوان «كلئوپاتر» و «بطلمیوس»ی سێزدەهەم بووبە شەڕ «ژولیوس سزار» بەلایەنگری كلئوپاتر، هاتە میسر و شاری ئەسكەندەرییەی گەمارۆدا. بطلمیوس پەنای بردە كۆشكی پاشایەتی، بۆ ئەوەی دەری پەرێنن، دەورو بەری كۆشكەكەیان ئاور تێبەر داو ئاور

گەیشتە کتێبخانەی ئـەسکـەندەرییەش و تەواو ـ یالانی کەم ـ بەشـی زۆری ئـەو کتێبخانەی سووتاند.

ئەم بەسەر هاتە، «قەیسەر» و «سیسرون» (شیشرون) و هەر وەها «تیتلیو» (طیطس لیفیس) ومێژو نووسەکانی دیکەی هاو زەمانی ژولیوس سزار نووسیویانە و فیلسوفی بەناوبانگی رووم «سنگ» (سنکا)ش، دوای سـەتەیەك کەلەو رووداوە گوزەرا وە، گێراویەتەوە، بە چەشنێکیوا، کەئەو بەسـەر هاتە، ناکرێ حـاشای لێ بکرێ.

دوای ئـەوە، دەورەی «ژولیوس سـزار» بە ئـاخر گەیشـتو «مارك آنتوان» (مرقص ینذونیس) وڵاتی میسـری داگیرکرد، گیرۆ دەی ئـەوینی «کلئـوپاتر» بوو ونزیکەی ساڵی چلی (٤٠) بەر لەزایین، تەواوی ئـەو کتێبانەی کە لە کتێبخـانەی پاشاکانی برجو (پرگام) ـ لە ئاسیای پچووك ـ بوو، پێشکەشی کرد بە کتێبخـانەی ئەسکەندەرییە.

ژمارەی ئەم کتێبانە، دەگەیشتە دووسەت هەزار و بوونی ئـەو کتێبانە، هێندێك لە رەونەق وبرەوی کتێبخـانەی ئـەسکـەندەرییەی زیاد کردەوە ودوایەش، زۆر لە کتێبە نووسراوەکانی پیاوە هەڵکەوتوە کانی رووم ویونان، بەم کتێبخانە پێشکـەش کرا.

کاتێ ئایینی مەسیح هاتە وڵاتی میسرەوە، زانستو ثَنَوێت (باوەری بەدووخـوا) لەگەڵ زانستو شـەریعـەتی مەسـیحییەت، بەرەنگـاری یەك بوون وفێرگە کانو ماموستاکانی مەسیحی ـ بەنهێنی ـ دەگەڵ زانستو زانینی قەدیم، دەستیان کرد بە دوژمنایەتیو بەر بەرەکانی.

چون ئیمپراتورەکانی رووم، ئایینی مەسیحیان قبولْ کردو ئەودینە بوو بە ئایینی رەسمی دەولەتی رووم، زانسـتو زانینی ئـایینی زەمانی پێشـوو باوەری بەدوخـوا، کەوتە دوا هەناسەی مردنو رفحـەکانی کتێبخـانەی ئـەسکـەندەرییە، لە کتێبە نووسراوەکانی زانایانی مەسیحیو کتێبەکانی ئایینی ئاخندران.

«تئـودوزی یەکەم» (تادوسـیس) (٣٧٨-٣٩٥) ئیمپراتوری رووم، لە ئـایینی مەسیح دا، زۆر دڵسـۆزو سـەختگیر بوو. ئـەمری کرد تا تەواوی پەرسـتشگاکان وفێرگەکانی بوتپەرسـتەکان تێك دەنو هەتا دەتوانن لە ناویان بەرنو بە تایبەت کۆشکی «سرابیس» ـ کە لە ئەسکەندەرییە دا بوو ـ و کتێبخانەی ئەسکەندەرییە ـ

که بەهۆی سووتان‌و رووخانی کۆشکەکانی «بطالسە»ی قەدیم راگوێز رابوونە ئەوێ ـ خاپوورکراو ئەوەی لە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە مابۆوە، بەم هۆیەوە لە ناو چوو.

لە ساڵی ٤١٥ی زایینی، فەرماندەی بەناوبانگی ئەسکەندەرییە، بەناوی «کیرلس‌ی گەورە» ـ کە لە ئایینی مەسیح دا لایەنگرێکی سەختگیر بوو ـ بە دوژمنایەتی دەگەڵ «هیپاتی» ـ ئافرەتی فەلسەفەزانی ئەو زەمانە ـ ئەو کتێبە فەلسەفیانە، کە لە دەورەی پێشو مابوونەوە، ئاگردران‌و «هیپاتی» بۆ خۆیشی کوژ را (٣٧٠-٤١٥).

لە ساڵی ٥٢٩ ئیمپراتوری بە ناوبانگی رووم «ژوستی نین» وای بەباش زانی تەواوی فێرگەکانی فەلسەفەی قەدیم لەناو چێ وبریاری دا، تا دەرگای فێرگەی بوت پەرستەکان ببەستن. ئەم فێرگەیە، تەنیا مەدرەسەیەك بوو کە لە چەشنی فێرگەی بوتپەرەستەکان مابۆ وە. وا بە بەستنی ئەو مەدرەسەیە، کتێبە نووسراوەکانی زانایانی دەورەی دوو خوایی، لە واڵاتی ئیمپراتوری رووم، لەبەین چون؛ بەجۆرێکی وا کە نازانین ئایا بەراستی لەکاتی پەلاماری عەرەب، کتێبخانەی ئەسکەندەرییە، خاوەنی کتێبانی فەلسەفە بوە یا خیر ولە *دایرةالمعارف*ی بەریتانیا بەم باسە ئیشارە کراوە. کەوابو، ئەوەی «ابوالفرج» سەبارەت بە سووتاندنی کتیبخانەی ئەسکەندەرییە، بەدەستی عەرەبان نووسیویە، هەڵەو دەلە سەیەك زیاتر نیە. چونکە کتێبخانەی ناوبراو، دوای ئەو سووتمانەی کەپێی گەیوەو دوای ئاگرێکی کە بە فەرمانی «تئودور» تێی بەر دراوە، خاوەنی ئەوەندە کتێب نەبوە کەشیاوی باس‌لێ کردن بێت.

ئەم باسە درۆیە لە کتێبی پێشینیانی عەرەب‌و رووم دا، باسی نەکراوە و تەنیا مێژو نووسێك شەش سەت ساڵ دوای گیرانی میسر، لە خۆرا، نووسیوە و گەورەی کردۆتەوە، و هەرای ساز کر دوە!! و لە حاڵێکا وڵاتی میسر خاوەنی مێژوە، باسی ناوبراو لە مێژوەکانی ئەوێ‌دا نابیندرێ.

«بطلر» لە ریشەوە ئەو باسەی لێك داوەتەوەو وتویە: «شك بۆ ئەوە ناچێ عەرەبەکان کتێبخانەی ئەسکەندەرییە یان سووتاندبێت؛ چونکە عەرەبان یازدە مانگ دوای زاڵ بوون بەسەر ئەسکەندەرییەدا هاتنە نێو شارەکە ولە بریاری ئاشتی‌دا نووسراوە کە روومیان ئەتوانن ئەوەی هەیانە لە ئەسکەندەرییە رای

گوێزن و لە تەواوی ئەو یازدە مانگە دا، ڕێگای دەریا کرابۆوە. کەوا بوو، ئەگەر لە کتێبخـانەی ئـەسکـەندەرییەدا، کتێبی زانســتی بۆ بایە، بەیەقین ڕوومیان لەگەڵ خۆیان ئەیان بردە دەرەوە».

بۆ ئـاگاداری زیاتر، بڕوانرێتە کتێبێکــی کە «شــبلی نعمان» ســەبارەت بە کتێبخانەی ئەسکەندەرییە نوسیویەو بەهۆی ئاغای «فخرداعی» بە فارسی وەرگێر دراوەتەوە.

**تەواو**